سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٢٧)



# کولتوری بەجیهانیبوون و مەترسی لە سەر کولتورە لۆکاڵییەکان

نووسینی: عومەر عەلی محەمەد

# Globalization culture and its role in jeopardizing local cultures



Written by
Omer Ali muhammad

Mail
07501112083

٢٠١٤

ناوی کتێب: کولتوری بەجیهانیبوون ومەترسی لە سەر کولتورە لۆکاڵیەکان

نووسینی: عومەر عەلی محەمەد

لە بڵاوکراوەکانی: سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری (٢٧)

دیزاین: ڕەوشت محەمەد

تیراژ: (٥٠٠) دانە

چاپی یەکەم: چاپخانەی (شڤان) ساڵی ٢٠١٤

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە(١٤٦٠)ی ساڵی ٢٠١٤ پێدراوە

**پێشکەشە بە:**

- ❖ بێگەرد خانی هاوسەرم، کە یارمەتیدەرێکی باشم بوو لە نووسینی ئەم کتێبە.
- ❖ هەرسێ مناڵە چاو گەشەکەم، ساکارو نڤار و محمد
- ❖ یەکێتی مامۆستایانی کوردوستان کە هاندەریکی باشبوون بۆ تەواوکردنی ئەم بابەتە.

## پێشەکی

بەجیهانیبوون کردەیەکی مێژووییە، لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین چەمك و پێناسەیەکی دیاریکراوی نییە، بەڵکو دیاردەیەکەو بەرئەنجامی کۆمەڵێك کارلێکی جۆراوجۆرە، لەلایەکی تریشەوە بەهۆی کەڵەکە بوونی کۆمەڵێك سیستەمەوەیە کە سەدان ساڵە دەستی پێکردووە، ئەمانەش هەموو بوارەکانی سیاسیی و ئابوری و کولتوری دەگرێتەوە، دیدو تێڕوانینەکان بۆ بەجیهانیبوون بەپێی ئایدیۆلۆژیاو جیهانبینیە جیاوازەکان دەگۆڕێت، لیبڕالیزمە نوێیەکان بە چارەسەرێکی ئەفسوناوی هەموو گرفتەکانی دەزانن بۆ هەموو کێشەکانی سەر رووی زەوی، ئەویش لەو روانگەیەوە کە بوارێکی کراوە دەڕەخسێنێت بۆ بازاڕێکی کراوە، هەتا هەموو لایەك کێبڕکێی تێدا بکەنو بەم هۆیەشەوە تۆڕێکی جیهانی دروست دەکات لە نێوان ئابوریە جیاوازەکانداو بواری کێبڕکێکەش بە فراوانی ئەنجام دەدرێت.

ئەم کتێبەی لە بەردەستدایە، بریتیە لە بەشی دووەمی نامەی ماستەرەکەم کە بەناوی "بەجیهانیبوون و کاریگەری لەسەر شوناسی کولتوری"یە، لەوکاتەوە کە چەکی بەجیهانیبوون بەشێوەیەکی بەرفراوان لە نێوەندی میدیای جیهانیو بەتایبەتیش لە نێو میدیای کوردیدا بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکار دێت، بەردەوام لە خولیای ئەوەدا بووم کە بتوانم کتێبێك بنووسم کە تیایدا بتوانم بە باشی هەڵسەنگاندنێکی کوردانە بۆ ئەم چەمکە بکەم و لە روانگەیەکی نیشتمانی و نەتەوەییەوە باسی بکەم (کە پەیوەندیەکی توندوتۆڵی لەگەڵ شوناسی مسوڵمانێتی هەیە)، ئەم کتێبە خوێندنەوەیەکە بۆ ئەم چەمکەو هەو لێکە کە بتوانێت خوێنەری کورد بەتایبەتیش میدیاکاران و قوتابیانی زانکۆ ئاشنا بکات بە پێناسەو ئامانج و

بوارەکـانی بـەجیهانیبوون، لـە هـەموو لایەنـەکانی سیاسـیی و ئـابووری و کولتوری، ئەوەی بـەلای منـەوە زۆر گـرنگ بـوو کـە لـە ئێستای کۆمـەڵگای کوردیدا جێگەی خۆی بگرێت، تێگەیشتنە لە جیهانگیری کولتوری، چونکە لە رووی سیاسـییەوە هـەتا ئێـستا کـورد خـاوەنی دەوڵـەت نییـە، لـە رووی ئابوریشەوە، پێگەیەکی ئابوری بەهێزی نییە. بەڵام لە ئێستادا بەهۆی بوونی رێژەیـەکی زۆر لـە یـەدەگی نـەوت لـە کوردسـتاندا ئـەم بـوارەش جێگـەی گەشـەپێدان و گرنگـی پێدانـە. بـەجیهانیبوون لـە بـواری کولتوریـدا لەسـەر ئاستێکی گـشتی جیهـانی خـاوەنی بەرنامـەو پلانێکـی سـتراتیجی تۆکمەیـەو لەسـەر ئاسـتێکی بـەرفراوانی میـدیایی کـار دەکـات، بـۆ ئـەوەی کولتـورە لۆکاڵیەکەی رۆژئاوا بکات بە کولتـوری جیهـانی، لـەناو رۆژئاواشـدا کولتـوری ئەمریکایی، لە هەوڵی سەپاندنی هەژموونی خۆیدایەتیو لە هـەوڵی ئەوەدایـە کە تەنانەت کولتوری وڵاتانی ئەوروپیش بخاتە ژێر رکێفی خۆی. کولتـوریش کە بریتییە لەلایەنی مەعنەوی ژیانی گەلان لە بـیروڕای ئـایینی و سیاسـیی و کۆمەڵایەتی و ئابوری، لەم روانگەیەوە دەتوانین بڵێین لەکاتێکدا کـە گـەلێك سەرکردەکانی ملکەچی کولتورێکی دیاریکراو دەبن، واتـە کاریگـەری لەسـەر جیهانبینیان پەیدا دەکات و دەبێتـە مایـەی گـۆڕانی دیـد و تێڕوانینـەکانیان لەڕووی سیستمی سیاسیی و فێرکردن و راگەیاندن و بەها کۆمەڵایەتیـەکان و ئەدەب و هونەرو... هتد.

لەبەرئەوە رۆژئاواییـەکان زۆر جـەخت دەکەنـەوە لەسـەر بـەجیهانیبوونی کولتـور، چـونکە هــەرکاتێك توانیـان کولتـوری رۆژئـاوا بکەنـە کولتـوری باڵادەستی گەلێك ئەوکاتـە هـەموو جۆرەکـانی تـری بـەجیهانیبوون بەدوایـدا دەچەسپێن.

کولتوری رۆژئاوایی رۆژبەرۆژ کاریگەری لەسەر ژیانی گەلان زیاتر دروست دەکات، چونکە لەلایەك ئەوان لە ئاستێکی جیهانیدا بالاّ دەستن، لەلایەکی تریشەوە گەلانی نارۆژئاوایی زۆربەیان بەهۆی تاکرەوی سیستمی سیاسیی و ئابوریەکی دواکەوتوو گەلانێکی ناهۆشیار نەیانتوانیوە ئەزموونی کولتورێکی کراوەو گەشەسەندوو نیشان بدەن. لەبەرئەوە رۆژئاواییەکان کولتورەکەیان وا نمایش دەکەن کە خاوەن زمانێکی ستانداردی جیهانیەو ئەدەب و هونەرێکی پێشکەوتووی هەیە، کە لە توانایدایە خزمەتی گەورە بە ژیان و ئەخلاق و مەعنەویاتی مرۆڤی نویێ بکات.

لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا بەشێوەیەکی بەرفراوان باسم لە بە ئەمریکایی بوونی کولتوری جیهانی کردووە، بەتایبەتیش لە بواری هونەردا، کە دەیەوێت جێگە بە هونەرو کولتوری هەموو نەتەوەکانی تر لێژ بکات و جێگەیان بگرێتەوە، بەپێی لێدوانی بەشێك لە سەرکردە سیاسیی و ئەکادیمیەکانی ئەوروپا، ئێستا هەست بە مەترسی گەورە دەکەن لەسەر کولتورە لۆکاڵیەکانی خۆیان، بەڵام ئەگەر سەیری نەتەوە نا رۆژئاواییەکان بکەین، بەتایبەتیش لە روژهەلاّتی ناوەڕاست و ولاّتانی ئیسلامیدا، هەست دەکرێت کە بەریەککەوتنێکی تر هەیەو ململانێیەکی توند لە نێوان کولتورە جیهانیەکەو کولتورە لۆکاڵیەکاندا هەیە، لەبەرامبەر کولتوری بەجیهانیبووندا، هەست دەکرێت کە کاردانەوەیەکی توند هەیەو زۆرجاریش بەهۆی تێنەگەیشتن و نەگونجان لەگەڵ کولتورە جیهانیەکەدا جۆرێك لە توندڕەوی بەرهەم دەهێنێت.

ئـەم کتێبـە دەیـەوێت خوێنـەر ئاشـنا بکـات بـە هـەموو ڕەهەنـدەکانی کولتـوری بـەجیهانیبوون و تیـشك بخاتـە سـەر هـەموو ئـەو هۆکارانـەی کـە بەکاریان دەهێنێت بۆ پەیداکردنی هەژموون بەسەر کولتورەکانی تردا.

ئـەوەی هـەتا ئێـستاش دەبینرێـت لـەناو میـدیای کوردیـدا دوو جـۆر کاردانەوەو لێدوانە بەرامبەر بە کولتوری بەجیهانیبوون، بەشێکی بریتییە لـە خۆبەدەستەوەدان و ملکەچی و بێ هەڵوێستی و خۆ بەکـەم زانـین، لای ئـەم جۆرە نووسەرانە کولتوری ڕۆژئاوایی بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە کولتـورێکی پێشکەوتووی گەشەسەندووەو دەبێت لە بەرامبەریدا ملکەچ و بـێ هەڵوێـست بێت. کە ئەمانەش زۆربەی ڕەوتی عەلمانی و لیبراڵەکان دەگرێتەوە.

بەشێکی تریش دەبینرێت کە بە هەموو شێوەیەك کولتوری بەجیهانیبوون بەرپەرچ دەدەنەوەو بە کولتوری داگیرکاری لە قەڵەمی دەدەن‌و وەك بەشێك لـە هـەژموونی سـەرمایەداری و ڕۆژئـاوایی دەبیـنین، ئەمانـەش بەشـێك لـە نووسەرانی ئیسلامی‌و چەپ دەگرێتەوە.

لەم کتێبەدا بە هێنانەوەی ڕای هەردوو لایەنەکە دەمەوێت باس لە ڕێگەی سـێهەم بکـەم ئـەویش سـەرەتا پێویـستە ئـەم چـەمکە لـە ڕووی مێـژوویی و زانـستیەوە بناسـرێت، پاشـان خاڵـە جەوهەریـەکانی شوناسـی نیـشتمانی و نەتەوەیی دیـاری بکرێـت و لـە پاشـاندا کولتـورێکی نـوێ بنیـات بنرێـت کـە لەلایەك هەڵگری خاڵە بەهێزەکانی کولتورە جیهانیەکە بێت وەك گرنگـی دان بە دیموکراسی و ئازادی و مافەکانی مرۆڤ و مافی ژنان... هتد.

لەهەمانکاتـدا جـەخت بکاتـەوە لەسـەر پاراسـتنی شوناسـی نیـشتمانی و نەتـەوەیی و ئـایینی و بـە مـۆرکێکی کوردانـەو لۆکـاڵی جـارێکی تـر پـەخش بکرێتەوە، بۆئەوەی لەلایـەك کۆمەڵگـەی کـوردی لـە پێـشکەوتنە زانـستی و

تەکنۆلۆژی و فیکریەکانی جیهان دوانەکەوێت، لەلایەکی تریشەوە پارێزگاری لـە شوناسـی کۆمەڵگـەی کـوردی بکـات. ئەگـەر سـەری کۆمەڵگـەی کـوردی خۆشمان بکەین بە ئاشکرا کاریگەری ئـەو کولتـورە بەسـەر گـەنجان و تـازە پێگەیـشتوان و زۆربـەی چـین و توێـژەکانی کۆمەڵگـەوە دەبیـنین، لـەروی زمانـــەوە دەبیـــنین کـــە زمانـــە بێگانـــەکان بەتایبـــەتی ئینگلیـــزی زۆر لـــە پەرەسەندندایە و بەردەوام قوتابخانەی ئەهلی دەکرێتەوەو ئاستی بەشـداری خەڵکیش ڕۆژ بـەڕۆژ زیـاتر دەبێـت. لـە بەرامبـەر ئەمـەدا زمـانی کـوردی ڕۆژ بەڕۆژ لاواز دەبێـت و گرنگـی پێـدانی گـەنجان ڕۆژ بـەڕۆژ کـەمتر دەبێتـەوەو نوسـین و توێژینـەوەکانی زمـانیش رویـان لـە لاوازی کـردووە، هـەروەها کاریگەری بواری هونەری لە گۆرانی و فیلم و ...هتـد، بێگانـەکان بەتایبـەتی کولتوری ئەمریکی ڕۆژبەڕۆژ لە پەرەسەندندایەو بەشێکی زۆری لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن کوردی داگیر کردووە.

لـە بەرامبـەردا ئەدایـەکی لاوازی هونـەری کـوردی هەیـە لـە روی فـیلم و شانۆدا، کە ئەمـەش کاریگـەری خراپـی لەسـەر بـواری کۆمەڵایـەتی دروسـت کردووە، بەتایبەتیش بۆ لاوازکردنی ڕۆڵی خێزان لە کۆمەڵگەدا.

وە لەبەرئەوەش کە حکومەت خاوەنی پـلان و بەرنامەیـەك نییـە لـە ئـەم بوارەدا، واتە پلانێکی نییە بۆ گەشەپێدانی کولتوری کوردی و گەشـەدان بـە گیانی خۆشەویستی و ئینتیما بـۆ نیـشتمان و نەتـەوە، بـەم هۆیـەوە ئێـستا ژمارەیەکی زۆر لە گـەنجان دەبیـنین کـە هـیچ سـۆزو خۆشەویـستیەکیان بـۆ نیـشتمان و نەتـەوە نییـەو وەك مرۆڤێکـی زۆر سـادەی بەکاربـەری بـازاڕی دەردەکەون، کە تەنها بەشوێن بەسەربردنی کاتێکی خۆش و سـەرقاڵ بـوون بە کولتورێکی بەکاربەردا دەگەڕێن.

بـواری کولتـور کـە بـواری کەسـایەتی و مەعنـەوی گەلانـە، بـوارێکی زۆر گرنگە لەبەرئەوە حکومەت و دەزگا بەرپرسـەکان و تەنانـەت رێکخراوەکـانی کۆمەڵگەی مەدەنی و راگەیاندنەکان دەبێت زۆر بە گرنگی سەیری بکەن و بە بەرنامەو پلانی نوێوە مامەڵەی لەگەڵدا بکـەن و لەهـەمان کاتـدا هەسـت بـە مەترسـیەکانی ئـەو کولتـورە جیهانیـە بکـەن و لـە بەرامبـەردا پرۆژەیـەکی کولتوری نەتەوەیی و نیشتمانی وا پێشنیار بکەن، کە ببێتە هۆکاری ئـەوەی نەوەی نوێ شانازی پێوە بکات و بەرگری لێ بکات.

**نووسەر**

**٦/٥/٢٠١٤ سلێمانی ـ کازیوە**

لــە ســەردەمی بــە جیهــانی بوونــدا چــەمکەکانی داگیرکــاری و هــەژموون گۆڕانکاریـان بەسـەردا دێـتو لـە شـێوازە تەقلیدیەکەیدا نامێننـەوە، بـەڵکو لەگەڵ پێشکەوتنی تـەکۆلۆژیاو شۆڕشـی زانیاریـدا. هێـزە بـاڵا دەسـتەکانو وڵاتە زلهێزەکان دەیانەوێت سیاسەتی داگیرکاریو هەژموونی خۆیان جارێکی تر لە رێگەی تەکنۆلۆژیاو پێشکەوتنە زانستییەکانەوە بەکارببەنو بۆ ئـەم مەبەستەش شۆڕشی زانیاری بـە هـەموو رەهەندەکانیـەوە دەخاتـە خزمـەت ویستو پلانی داگیرکاریو جارێکی تر بە رێکخستنێکی نوێ دەیـەوێت خـۆی نمایش بکاتەوەو کۆنترۆڵی سەرچاوەی دەسەڵاتو ئابوری وڵاتانی تر بکـاتو بـۆ ئـەم مەبەسـتە دەچـێتە بـواری کولتـوری، دەیـەوێت بـە تێکـشکاندنی کولتــوری بەرامبــەر هــەژموونی خــۆی فــەرز بکــاتو خــۆی وەك هێزێکــی ســەرکەوتوو نمــایش بکــات "بــۆ ئــەم مەبەســتە جۆرێــك لــە هــەژموون بەکاردەهێنێت کە بەسەر بەرامبەرەکانـدا فـەرزی دەکـات، بەمـەش بـەهێزی دەســەڵات خــۆی دەردەخــاتو لــەم رێگەیەشــەوە هــەوڵی بــەردەوام دەدات بەشێوەی ئاشکرا بێت یان نهێنی"[1]

لەگــەڵ ئــەم بۆچــوونەدا، هەنــدێك لــە رونــاکبیران لــەو بڕوایــەدان کــە بــەجیهانیبوون بریتییــە لــە ســەردەمی گــۆڕانی گــەورە کــە لەســەر دەسـتی سیستمی سەرمایەداری دروست دەبێتو هەڵقوڵاوی گۆڕانکاریـەکی مێـژوویی درێژخایەنە، لەبەرئەوە نابێت هیچ گەلو نەتەوەیـەك بـەرەو رووی ببێتـەوە، دەبێــت وەك حەقیقــەتی مێــژوویی مامەڵــەی لەگەڵــدا بکــات. هــەر بۆئــەم مەبەسـتەش دەبیـنین کـە ئـەم روناکبیرانـە بـە جیهـانی بـوونی کولتـوور بـە شتێکی ئاسایی دەبینن‌و بـە پێویـستی دەزانـن کـە هـەموو گـەلان ملکەچـی

---

[1] الهوية الثقافية وسبل التعامل معها...http//:wwwnawaat.org/portail/article.php3?id article=125

هەژموونی ئەم کولتورە جیهانیـە بـبن‌و زۆر بـە خۆشـباوەڕی مامەڵـە لەگـەڵ دۆخە نوێیەکەدا بکەن و ئەم کولتورە نوێیەش بە کولتوری جیهانی لە قەڵەم دەدەن، وای دەبینن کە پێویستە وەك شوناسێکی جیهانی بۆ تەواوی گـەل‌و نەتەوەکان مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین ئەمە دیدێکی سادەو خۆشباوەڕیە لە بەرامبەر کولتوری رۆژئاواداو هیواخوازییەکی تیۆریـە لە خەیاڵدا، چونکە ئەوەی لە واقیعـدا دەبینرێـت شـتێکی جیـاوازەو ناچـێتە خانــەی ئــەم خۆشــباوەڕیەوە، بــەڵکو لــەودیوی ئــەو کولتــورەوە ویــست‌و ئامانجێکی تر هەیە کە بەشێکی ناکولتوری‌و نامرۆیی‌و داگیرکاریە.

چـونکە ئەگـەر سـەرنج بـدەین ئـەو بـوارە ئازادیـەی کـە بـەجیهانیبوون دەیڕەخسێنێت، خۆرسك نییەو بۆ هەموو نەتەوەو گـەلانیش یەکسان نییـە، بەڵکو ئەو کولتورە پەیوەست کراوەتەوە بە سیاسـەتی وڵاتـە زلهێزەکانـەوە کــە هــەژموونی خــۆی ســەپاندووە بەســەر بــوارە ســەرەکیەکانی دارایــی‌و سیاسـیی‌و تـەکنۆلۆژی‌و تەکنیکیـدا، لـەم رێگەیەشـەوە کـۆنترۆڵی بـازاڕی جیهانی کردووە، لێرەشەوە وڵاتە زلهێزەکان خۆیان فەرز دەکـەن لـە بـواری بازرگانی‌و ئاڵوگۆڕی کولتوریدا[٢].

بـەجیهانیبوونی کولتـور لـەم رۆژگـارەدا پەیوەسـتە بـە هێـزی زانـستی‌و تەکنۆلۆژیەوە، لەبەرئەوە لەم کایە جیهانیە نوێیەدا ئەو کولتـورە باڵادەسـت دەبێت کە لە توانایدا هەیە بەهێزترین هۆکاری تەکنۆلۆژی لـەخۆ بگرێـت بـۆ بڵاوکردنـەوەی بیروبۆچـونەکانی، وەئەمـەش ئـەمڕۆ بـەهێزترین هۆکـارە بـۆ بڵاوبوونەوەی کولتـور لەسـەر ئاسـتێکی جیهـانی فـراوان، ئـەو گەلانـەی کـە خاوەنی ئەو هۆکارە تەکنۆلۆژیە نوێیانەن دەتوانن بە ئاسانی بگەنـە هـەموو

---

[٢] د.برهان غليون،د.سمير أمين:ثقافة العولمة وعولمة الثقافة... سابق،ل٣٢

**قـوژبنێكی ئـەم جیهانـەو بـەجوانترین شـێوە خۆیـان نمـایش بكـەنو وەك كولتورێكی جیهانی دەربكەون، بەڵام ئەگەر نەتەوەیەك لە توانایدا نەبێت كە هۆكارە تەكنۆلۆژیەكان بەكار بهێنێت، هەرچەند خاوەنی كولتورێكی بـەهێزو مرۆیش بـن نـاتوانن لەسـەر ئاسـتێكی جیهـانی نمـایش بكـەنو لـە بەرامبـەر كولتورەكانی تردا كێبڕكێی پێ بكەن.**

**دكتۆر محمد عابد جابری دەڵێت "بەجیهانیبوون تەنها هۆكارێك نییـە بـۆ سیـستمی سـەرمایەداری، بـەڵكو بۆتـە پێگەیـەك بـۆ بنیاتنـانی نموونەیـەكی تایبەتی"، هەرچەند بەجیهانیبوون لە روویەكـەوە رواڵـەتێكی بنـچینەییە لـە رواڵەتەكانی پێشكەوتنی شارستانی كە لەم سـەردەمەدا لـە ئارادایـە، بـەڵكو لەپاڵ ئەمەدا تەعبیر لە ئایدیۆلۆژیایەك دەكات كە لە دوایەوە ویـستێك هەیـە بۆ سەپاندنی هەژموونێك بەسەر جیهانو بە ئەمریكایی كردنی[٣].**

**"لــەم روانگەیــەوە بــەجیهانیبوون بەشــێوەیەكی گــشتی دژە لەگــەڵ بنەماكانی یاسای نێودەوڵەتیو لەگەڵ سروشتی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەكان، هەروەها دژە لەگەڵ ئابوری نیشتمانیو سەروەری نیشتمانی و لەگەڵ فرەیی كولتوریدا"[٤] ئەو شێوازەی كە هێزەكانی نێو كۆلۆنیالیزم پەنای بـۆ دەبـەن لەسەردەمی بەجیهانیبووندا، بەدەرن لە شێوازە سەربازیە تەقلیدیەكان، كـە خۆی لە داگیركاری راستەوخۆو بەكارهێنانی هێـزی سـەربازیدا دەبینێتـەوە. بەڵكو ئەمجارەیان غەزوێكی ترە كـە راسـتەوخۆ دەیـەوێت بـچێتە نـاو دیـدو ئایدیاو جیهانبینی تاكەكانو فەزایەكی نوێ بـۆ داگیركـاری بخوڵقێنێـت، كـە ویستو ئیرادەو شێوازی بیركردنەوەو سلوكی تاكەكان دەگۆڕێت.**

---

[٣] د.محمد عابد الجابري:العولمة والهوية الثقافية–عشراطروحات، **سەچاوەی پێشوو**،ل٢٠٠

[٤] د.عبدالعزيز بن عثمان التويجري:الحوار من أجل التعايش،، **سەچاوەی پێشوو** ل٦٩

بورهان غلیۆن دەڵێت: "من لەو کەسانەم کە بڕوام وایە کە بەجیهانیبوون مەترسی هەژموونیو کاریگەری زۆرترە لە ئمپریالیزمی تەقلیدی، چونکە ئەوەی دواییان ڕێگا توندوتیژەکان بەکارناهێنێت، بەڵکو لە هەوڵی ئەوەدایە کە خەڵك ڕازی بکات بەخۆیو تێکەڵ بە خۆیانی بکات، هەروەها گفتوگۆ لەگەڵ عەقڵو خەیاڵیاندا دەکات پێش ئەوەی مامەڵە لەگەڵ دەرامەتە سروشتیەکان و بازاڕەکانیان بکات، هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی جیهانی لەم ڕۆژگارەدا زۆر لەناوبەرترن بۆ وڵاتانی تازە پێگەیشتوو، لەو جەنگی ئەفیونەی کە لەکاتی خۆیا دژ بە چین کرا"[٥]

لە کولتوری بەجیهانیبووندا جۆرێك لە ئایدیۆلۆژیای تایبەتی هەیە، کە لە ڕێگەی بەجیهانیبوونەوە دەیەوێت بەهاوجیهانبینی تایبەتی خۆی لە کۆنەستی تاکی بەرامبەردا بچێنێت، ئەم جۆرە مامەڵەیە بە ئاشکرا لە جیهانبینی لیبراڵی ڕۆژئاواییدا دەبینرێت بەرامبەر بە گەلە ناڕۆژئاواییەکان، ئەمەش بەئاشکرا لەناو ئەکادیمیو سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوەی ستراتیجی دا دەبینرێت، بەتایبەتیش لە بۆچوونی ئەوانەی کە بە ڕۆژهەڵات ناسە نوێیەکان ناو دەبرێن، کە دەیانەوێت بۆچوونە ڕۆژئاواییەکان جۆرێك لە پیرۆزییان پێ بدەن.بەڵام کولتورەکانی تر بە بەربەریەتو دواکەوتوو توندوتیژ ناو بەرن لەم ڕێگەیەوە دەیانەوێت هەموو خاڵە بەهێزەکانی ئەم کولتورانە تێك بشکێننو لەلای تاکی ناڕۆژئاوایی سایکۆلۆژیەتێکی شکست خواردوو دروست بکەنو وای لە قەڵەم بدەن کە هۆکاری دواکەوتووییو نەزانیو نەفامی ئەم گەلانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کولتورە دواکەوتووە، لەبەرئەوە وا لە هەرتاکێك دەکەن بەتایبەتیش تازە پێگەیشتوان کە بە چاوێکی سوك سەیری شوناسو

[٥] د.برهان غليون، د.سمير امين :ثقافة العولمة و عولمة الثقافة، سەچاوەی پێشوو، ل١٣٤

تایبەتمەندیە کولتوریەکان بکەن‌و هەوڵ بدەن خۆیانی لێ رزگار بکەن‌و لە جێگەیدا هەوڵی چاندنی کولتوری رۆژئاوایی بدەن، رۆژئاواییەکان لەم رووەوە تارادەیەك سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، چونکە ئەوان خاوەنی ماشێنێکی زەبەلاحی راگەیاندنن لە بیستراو و بینراو و نوسراو کە لە توانای کولتورە نارۆژئاواییەکان بەتایبەت لە وڵاتانی باشوردا نییە کە روبەروویان بوەستنەوە.

بەجیهانیبوون وەك پرۆژەیەکی رۆژئاوایی ئەوکاتە خۆی وەك پرۆژەیەکی رۆژئاوایی نمایش کردوو لەرووی سیاسیی‌و ئابوری‌و ئایدیۆلۆژیەوە تەعبیری لە خۆی کرد، کە بڕیاری داگیرکردنی گەلانی تری دەرکرد، کە تیایدا مەبەستی بە ئەوروپایی کردنی جیهان بوو Europeanization ئەمەش رێکخستنەوەیەکی نوێی جیهان بوو لەسەر دابەشکردنێکی نوێی نابەرامبەر لە نێوان وڵاتە داگیرکەرەکان و داگیرکراوەکاندا، بۆ نموونە ئەمریکای باکور لە رابردوودا بەرەو رووی ئەم داگیرکاریە بویەوە لەلایەن بەریتانیاوەو توانی بیکاتە پاشکۆی خۆی‌و بەهەمان شێوازی تەقلیدی ئەو بوە پەراوێزی[٦] زۆر لە فەیلەسوف‌و روناکبیرانی رۆژئاوایی بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە کولتوری رۆژئاوا تاکە کولتورێکە کە بتوانێت مرۆڤایەتی رزگار بکات‌و لە سایەیدا مرۆڤ هەست بە مرۆڤ بوونی خۆی بکات لەرووی ئازادی‌و ماف‌و عەدالەتەوە، هەندێك لەو فەیلەسوفانە وەك (کانت) کولتوری پێشکەوتووی پیاوی سپی رۆژئاوا دەبەستێتەوە بە ژینگەو جوگرافیاوە، لەبەرئەوە وای لە قەڵەم دەدات کە هۆکاری سەرەکی پێشکەوتنی کولتوری رۆژئاوا

[٦] ادريس هاني: المفارقة والمعانقة، (رؤية نقدية في مسارات العولمة وحوار الحضارات)،المركز الثقافي العربي،بيروت،٢٠٠١، چ١،ل١٩

دەگەڕێتەوە بۆ ژینگەی ڕۆژئاوا، کە ژینگەیەکی پاكو ساردو فێنکەو ئەم ژینگەیەش بەردەوام مرۆڤی هۆشیارو چاك بەرهەم دەهێنێت، بەڵام ژینگەی ئەوانیتر کە گەرمو شێدارو وشکە، مرۆڤی تەمبەڵو خەواڵوو ناهۆشیارو دواکەوتوو بەرهەم دەهێنێت، لەبەرئەوە لە روانگەی هەندێك لە روناکبیرەکان دواکەوتوویی نارۆژئاواییەکان واقیعێکی مێژووییەو پەیوەستە بە ژینگەکەیانەوە. ئەم بۆچوونە رەگەز پەرستانە نەك هەر لە سەدەکانی رابردوودا لە ئارادابووە، بەڵکو ئێستاش لەسەر ئاستێکی بەرز لە ئارادایەو لە کۆتاییەکانی سەدەی بیست دا لە دوای هەرەسی یەکێتی سۆڤیەت دەبینین کەسێکی وەك (فۆکۆیاما)، قۆناغی دوای ئەو هەرەسە ناودەبات بە کۆتایی مێژوو، وەسفی ئایدیۆلۆژیای نیو لیبراڵی دەکات وەك رزگارکەری مرۆڤایەتی لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتی، لێرەوە شکستی هەموو ئایدیۆلۆژیاو ئاینو شارستانیەتەکانی تر رادەگەیەنێت، ئەم راگەیاندنەی فۆکۆیاما لە روانگەیەکی ئازادانەی گەلان نەبوو بۆ ئەم ئایدیۆلۆژیا نوێیە، بەڵکو رۆژئاوا لە رێگەی دەزگا زەبەلاحە سەربازیو سیاسییو راگەیاندنو ئابوریەکانیان کەوتنە سەپاندنی بەسەر گەلە نارۆژئاواییەکانو بۆ ئەم مەبەستەش زۆرجار ئەنجوومەنی ئاسایشو رێکخراوە ئابوریە گەورەکان وەك سندوقی دراوی نێودەوڵەتیو رێکخراوێکی سەربازی وەك ناتۆ بەکارهێناوە.

ئەگەر سەیری کرۆکی بە جیهانی بوون بکەین دەبینین ناوپۆش کراوە بە ئایدیۆلۆژیای نیو لیبرالیو ئەمەش وەك کولتورێکی جیهانی نمایش دەکرێت. ئایدیۆلۆژیای بەجیهانیبوون بریتییە لە نیو لیبراڵی نوێ، ئەمەش جیاوازە لە لیبراڵیەتی کلاسیکی کە لە شۆڕشی فەرەنسی دا پێناسە کراوە، بەتایبەتیش

لەسەر دەستی (جان جاك رۆسۆ، هەروەها جیاوازە لە لیبرالّیەتی دیموکراتی کە داوای چەسپاندنی دەولّەتی خۆشگوزەرانی دەکات).

(جان زیغلەر) خاوەنی کتێبی (رابەرانی جیهانی نوێ) نیو لیبرالیزم بەم شێوەیە پێناسە دەکات (بنەمای پێکهاتنی فیکری نیو لیبرالی بریتییە لە بە گەورەگرتنی قازانج، کێبڕکێی بێ سنور و بێ پارێزەر بە جیهانی بوونی ئالّوگۆڕی بازرگانی، لەناوبردنی کولتوری لۆکالّی، کە ئەمەش دژە لەگەلّ هەموو بەها چەسپاوەکان لەسەردەمی رۆشنگەریدا، چونکە ئەو بەهایانە بنەمای پێکهاتنی شارستانیەتی ئەوروپییە. لەبەرئەوە لەژێر سایەی ئەم ئایدیۆلۆژیەدا نەك دەولّەتو کۆمەلّگەی سیاسیی بەلّکو کۆمەلّگەی مەدەنیش دەبێتە قوربانی ئیمپراتۆریەتی سەرمایە)[(٧)].

لە کایەی بەجیهانیبووندا، ئەمریکا دەیەوێت ببێتە ئەو هێزەی کە رابەرایەتی جیهان بکاتو کولتورەکەشی بە کولتورێکی جیهانی لە قەلّەم بدات.

(جان زیغلەر) بەم جۆرە باسی رۆلّی ئەمریکا دەکات لە ئایدیۆلۆژیای نیولیبرالیزم دا:

ئایدیۆلۆژیای نیولیبرالیزم هەلّدەستێ بە ئەنجامدانی مێشك شۆردنەوەیەکی ترسناك کە دەبێتە مایەی خێرو خۆشی بۆ دەولّەمەندەکانو هاوپەیمانە جیهانیەکانی ئەمریکا دژ بە ئیرهاب کە جۆرج بۆش بانگەشەی بۆ دەکرد. هەروەها هەموو ئۆپۆزسیۆنەکانی بەجیهانیبوونو ئەوانەش کە دژایەتی بەتایبەتمەندبوونی جیهان دەکەن، تووشی نەفرەتو بێبەری بوون

[(٧)] جان زيغلر:سادة العالم الجدد:العولمة-النهابون-المرتزفة ترجمة،علي خليل محمد/مركز دراسات الوحدة العربية،بيروت،٢٠٠٣،ل٢٧٩

دەكات، ئەوانەش كە دژی ئەو سەرمایە بێ سنورە جیهانیە دەوەستنەوە دەیانخاتە دەرەوەی شارستانیەتی نوێ[٨].

لە چوارچێوەی بەجیهانیبووندا، دان نانرێت بە ئاستە جیاوازەكانی گوزەرانو ژیان لە نێوان نەتەوەو دەوڵەتە جیاوازەكاندا، بەتایبەتیش لەكاتێكدا كەمینەیەك زۆربەی سامانو دارایی جیهانی كۆنترۆڵ كردووەو زۆرینەیەكیش بەتایبەتی لە ولاتانی باشور لە بارودۆخێكی ناهەمواری هەژاریو نەداریو دواكەوتویی ئابوریو سیاسییو كۆمەلایەتیدا دەژین.

لەبەرئەوە ئەو بۆچوونەی كە نیولیبرالیزم ی سەرمایەداری هەیەتی بۆ جیهان لەگەڵ وێنە واقعیەكەدا ناگونجێت، چونكە ئەو هەوڵ دەدات كە جیاوازیو فرەیی لە بواری شوناسو كولتورو نەتەوەو زمانو ئاینو جوگرافیاكان نادیدە بگرێتو هەموویان بخاتە یەك چوارچێوەوە، ئەمەش مەترسی ئەوبۆچوونە دەسەلمێنێت كە ئەوان هەیانە بۆ جیهان[٩].

لەم روانگەیەوە، دەتوانین بلێین ئەمریكا لە هەولی ئەوەدایە كە ببێتە سەرداری جیهانو دەست بگرێت بەسەر هەموو رەهەندەكانی ژیان لەسەر ئاستێكی جیهانی، ئەمە نەك تەنها بەرامبەر بە ولاتانی باشور، بەلكو بەرامبەر بە ئەوروپاش هەمان دیدو بۆچوونی هەیە، لەم بارەوە دكتۆر بورهان غلیۆن جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە سەرەڕای ئەوەی كە لیبرالیزمی سەرمایەداری بۆ خۆی تووشی قەیرانی جۆربەجۆر بۆتەوە، رۆژ

---

[٨] هەمان سەرچاوە. ل. ٢٢٣

[٩] د.حسين عبدالهادي:العولمة النيوليبرالية وخيارات المستقبل..مركز الراية للتنمية الفكرية،المملــة العربيــة السعودية-جدة،چ١، ٢٠٠٤، ص١٢٠-١٢١

بەرۆژ هەژموونی سەرمایەداریو بەتایبەتیش ئەمریکا زیاد دەکات لەسەر ئاستێکی جیهانی[١٠].

هەر لە دوای روخانی یەکێتی سۆڤیەت ئەمریکا لە هەوڵی ئەوەدایە کە ئەو بۆشاییە جیهانیە پڕ بکاتەوە بەتایبەتی لەرووی ئایدیۆلۆژیەوە، بۆ ئەم مەبەستەش ویستی بەشێوەی داگیرکارێکی نوێ لە قاڵبی نیولیبرالیزم دا هەژموونی خۆی بەسەر جیهاندا بسەپێنێت، ئەمەش نایەوێت خۆی وەك داگیر کارە تەقلیدیەکان نیشان بدات، بەڵکو دەیەوێت بە گوتارێکی نوێو زۆرجار لەژێر گوتاری بڵاوکردنەوەی دیموکراسیو ئازادی بۆ گەلان خۆی نمایش بکات. بەڵام دواجار تەنها ئەو ئامانجەی هەیە کە هەوڵی بۆ دەداتو ئامانجەکەش گەشەدان بە دیموکراسی نییە، (چونکە لە چوارچێوەی ئەو بانگەشە دیموکراسیەدا زیاتر هانی دابەش بوونو ناکۆکیە نەتەوەییو ئاینو رەگەزیو کولتوریەکان دەدات بەناوی دیموکراسیو مافی مرۆڤ)، هەروەها جەخت دەکاتەوە لەسەر ململانێی کولتورەکانو ئامانجیش لەمە هەڵوەشانەوەی کیانە گەورەکانە کە لەسەر بنەمای فرە کولتوریو ئاینی دروست بوون، بەڵام لەلایەکی تریشەوە کار لەسەر یەکخستنی جیهان دەکات لەسەر بنەمای کولتوری ئەمریکی بە پلەی یەکەم[١١].

جاك شیراکی سەرۆکی فەرەنسی لە وتەیەکیدا بە بۆنەی رۆژی نیشتمان لە (١٤ یولیو ٢٠٠٠)دا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە بەجیهانیبوون لە هەوڵی سەپاندنی هەژموونی نوێدایە بەسەر توانای حکومەتەکانو گەلانی

---

[١٠] برهان غليون:العرب وتحولات العالم(من سقوط جداربرلين إلى سقوط بغداد "حوار اجراه:رضوان زيادة،المركز الثقافي العربي، بيروت، چ٢٠٠٢،١،ل١٥

[١١] د.مجيد الراضي:الثقافة والعولمة،بحث في الجذور، **گۆڤاری** النهج ژ ١٩،صيف،١٩٩٩،ل٥

جیهان بەشێوەیەکی گشتی. ئەو لە وتەکەیدا وتی: "بەجیهانیبوون پێویستی بە رێکخستن هەیە، چونکە دەبێتە مایەی بەرهەم هێنانی دابڕانێکی گەورەی کۆمەڵایەتی هەرچەند لەلایەکەوە بەجیهانیبوون هۆکاری پێشکەوتنە، بەڵام لەلایەکی تریشەوە مایەی مەترسیەکی گەورەیەو دەبێت بیری لێبکرێتەوە، بەبڕوای من ئەو مەترسیانەش لەسەر سێ ئاستدایە، یەکەمیان: دیاردەی جیاوازی ئابوری کۆمەڵایەتی زیاد دەکات، دووەمیان: مانای تاوانێکی جیهانی گەورە دەگەیەنێت، سێهەمیان: مەترسی دروست دەکات بۆسەر سیستمە ئابوریەکەمان"[١٢].

لە سەدەکانی رابردوودا کۆمەڵێك لە رۆژهەڵات ناسو مژدەدەرە مەسیحیەکان هەبوون کە لەسەر ئاستی جۆراوجۆری کولتوریو هونەریو پەروەردەییو ئەکادیمی لە هەوڵی چەسپاندنی کولتوری رۆژئاوایی دا بوون لەناو کۆمەڵگە رۆژهەڵاتیەکاندا، هەتا لە ئەم رێگەیەوە رێگە خۆش بکەن بۆ داگیر کەرە ئەوروپیەکان بۆئەوەی بێنە ناو وڵاتانی ئیسلامیو رۆژهەڵات، لەم روەوە دەتوانین بڵێین لێکچوونێك هەیە لە نێوان رۆڵی ئەوانو ئەوەی کە ئێستا لەژێر سایەی بەجیهانیبووندا ئەنجام دەدرێت، ئەوان کاریان لەسەر کولتوری گەلە رۆژهەڵاتیەکان دەکردو دەیانویست لە دیدو تێڕوانینی ئەو گەلانەدا کولتورە لۆکاڵیەکان لە ئاستێکی نزمدا لە قەڵەم بدەنو تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایانە بکەن بە دوژمنی کولتورەکەیانو هەر بە دەستی خۆیان کولتورەکەی خۆیان لە گۆڕ بنێنو بکەونە دژایەتیو بە چاوێکی سوكو دواکەوتوو سەیری بکەنو لە بەرامبەردا کولتوری داگیرکەران کە ئەوروپیەکان بوون بە کولتورێکی پێشکەوتوو رزگارکەر لە قەڵەم بدەن،

---

[١٢] د.عبدالعزيز بن عثمان التويجري:العالم الإسلامي في عصر العولمة، سەچاوەی پێشوو، ل١٦

لەبەرئــەوە کولتــوری ئــەوروپایان کــردە سەرچــاوەی هونــەرو ئــەدەبو پەروەردەو بە کولتـورێکی بەرهـەم هێنـەر ناسـاندیان، کولتـوری رۆژئـاوا لـە ئاسـتێکی جیهانیـدا پێگـەی یەکـەمی پێـدرا، "بـەم هۆیەشـەوە غـەزوێکی کولتوری بە ئالیەتی تایبەتی ئەنجامدرا، کـە بوەهـۆی ئـەوەی ئـەو کولتـورە پێگەیەکی تایبـەتی پـێ بـدرێتو تـوانی بـچێتە کرۆکـی کۆمـەڵگاکان، بـەڵام بەشـێوەیەکی هێـواشو بەرنامـە بـۆ داڕێـژراو، وە تـوانی جێگـە بـە بـەها لۆکاڵیەکان لەق بکات"[13].

**بەڵام لەدوای قۆناغی داگیرکردن ئامانجەکە بوەهۆی سەپاندنی هەژمونی کولتـوریو بـرەودان بـە بـەها** رۆژئاواییـەکان لـە جیهـانی سـێ دا، بـۆ ئـەم مەبەستەش باکوریەکان هەموو جۆرە گفتوگۆو لەیەکتر تێگەیشتنێکیان رەفز کرد، کە دەربارەی بەها کولتوریەکان ئەنجام بدرێت لەگەڵ باشوردا، بۆ ئـەم مەبەستەش ئەوان بەها تایبەتیەکانی خۆیـان کـردە پێـوەرو هـەر ئەوانـەیان کـردە بەهایـەکی جیهـانیو واشـیان لـە قەڵـەم دا ئەگـەر جیهـانی سـێ ئـەم بەهایانە قبوڵ بکەن، ئەوا هەموو گرفتـەکانیان لـەرووی ئـابوریو سیاسـیو کۆمەڵایەتییەوە چارەسـەر دەبـن، سـەرەڕای ئـەوەی کـە رۆژئـاوا توانایـەکی سەربازیو ئەتۆمی گەورەی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا، رۆژئـاوا دەیـەوێت لەسەر ئاسـتێکی جیهـانی فـرە کولتـوری لەناوبـەرێتو کولتـورێکی جیهـانی دروست بکات، کە ئەویش کولتوری رۆژئاوایە[14].

گوتـاری کولتـوری رۆژئـاوا سـەرەڕای ئـەوەی کـە هـەر لـە سـەردەمی ئیمپریالیزمەوە بەردەوام بووە، بەڵام پێی ناوەتە قۆنـاغێکی نـوێو جـارێکی

---

[13] جیهان سلیم : عولمة الثقافة واستراتیجیة التعامل معها، ، ل سەرچاوەی پێشوو ١٢٥

[14] ابراهیم ابو ربیع:العولمة هل من رد إسلامي معاصر،إسلامیة المعرفة،الکویت، ژ ٢١،صف ٢٠٠٠م،ل١٩

تر لەگەڵ پێشکەوتنە تەکنۆلۆژیە نوێیەکەدا دارشتنێکی نوێی بۆ کراوەو بە گوتارێکی نوێ پەخش دەکرێت، بەڵام لە راستیدا هەر لەسەر هەمان ئامانجەو هەمان تێڕوانینی هەیە بۆ ئەویتر، چونکە لەم قۆناغەشدا دەیانەوێت بەناوی سەرکەوتن‌و پێکەوەژیانی کولتوریەوە، کۆتایی بە فرە کولتوری بهێنن، بۆ ئەم مەبەستەش هەموو جۆرە هۆکارێکی توندوتیژو زۆرکردن‌و داگیرکاری بەکار دەهێنن‌و هەوڵ دەدەن کە کولتورەکەیان زاڵ بکەن بەسەر کولتورەکانی تردا. کە ئەمەش پێچەوانەی ئازادی‌و مافی مرۆڤو دیموکراسی‌و دان نانە بە جیاوازی‌و بوونی ئەوانی تردا.

بەداخەوە لە ئێستادا بنەمای بە جیهانی بوون لە بواری کولتوریدا داننان نییە بە بوونی ئەوی تردا، کە هەڵگری کولتورێکی جیاواز بێت کە دەکرا لەسەر بنەمای خاڵە هاوبەشەکان مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت‌و وەك پێوەرێك بۆ یەکسانیەکی راستەقینە لە نێوان کولتورەکاندا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، بە پێچەوانەی ئەمەوە هەوڵێك لە ئارادایە بۆ لە رەگ دەرهێنانی ئەویترو لاوازکردنی لەرووی کولتوریەوە[(١٥)]

ئەوانەی کە هەوڵی هەژموونی کولتوری دەدەن، پشت بە کۆمەڵێك رەگەزی شوناسی نەتەوەیی و ئاینی دەبەستن و دەیانەوێت لە چوارچێوەی ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەتەوە فەرزی بکەن، کە ئەوانیش بریتین لە:

١- بڕوابوون بە باڵادەستی کولتوری‌و رەت کردنەوەی ئەوانیتر.

٢- لەم روانگەیەوە هەوڵ دەدات کە فەرزی ئایدیۆلۆژیا تایبەتییەکەی خۆی بکات بەسەر بەرامبەرەکانیدا.

---

(١٥) د.مجيد الراضي:الثقافة والعولمة،مجلة النهج،، ص سەچاوەی پێشوو ل٥١

٣- زۆرجار پەنا دەباتە بەر توندوتیژی بۆ فـەرزکردنی ئامانجـەکانی ئـەو بزوتنەوانەی کە بڕوایان بە هـەژموونی کولتـوری هەیـە، بڕوایـان وایـە ئـەوان خاوەنی کولتوری بـاڵاو بـە چـاوێکی نـزم سـەیری کولتـوری بەرامبـەرەکان دەکەن و جۆرێك لە پاکیو پیرۆزی بۆ خۆیان بڕیار دەدەنو بەرامبەرەکانیش وێنەیـەکی دزێویـان بـۆ دروسـت دەکرێـت، لـە بەربـەریو دواکـەوتویی و توندڕەوی و دوور لە بـەها مرۆییـە پێـشکەوتوخوازەکان. هەرکەسـێکیش لـە بەرامبەر کولتوری ئەواندا بوەستێت ئەوە مانای قبوڵ نـەکردنی مەدەنیـەتو شارستانیەت دەگەیـەنێتو نابێـت لـە سـایەی سیـستمە نوێیـە جیهانیەکـەدا پێگەیەکی هەبێت بۆ ژیان یـان ڕێـز لـە بۆچـوونەکانی بگیرێـت. بـۆ دروسـت کردنی ئەم وێنەیەش زۆرجار ئەکادیمیەکانو ڕاگەیاندنکارانو دەزگای گەورە لە ئاستی جیهانیدا بەشداری تێدا دەکەن.

## بوارەکانی هەژموونی کولتوری

## یەکەم :هەژموونی زانیاری و تەکنەلۆژی

سیستمی جیهانی نوێ کە خۆی لە بەجیهانیبووندا دەبینێتەوە، هەڵقوڵاوی کانگای پێشکەوتنو تەکنۆلۆژیاو شۆڕشی نوێی زانیاریە، هەر بۆ ئەم مەبەستەش دەتوانین بە جیهانی بوون بە دیاردەیەکی رۆژئاوایی لە قەڵەم بدەین، کە هەڵقوڵاوی گەشەی پێشکەوتنی کۆمەڵگەکەیەتی، لەبەرئەوە ئێمە بە جیهانی بوون وا دەبینین، بۆ بڵاوبوونەوەو گەشەو هەوڵەکان لە دەست بەسەراگرتنی جیهاندا، هەموو سەرچاوەکانی زانیاری کۆنترۆڵ کردووەو هەموو هۆکارە تەکنۆلۆژیا نوێیەکانیش بەکار دەهێنێت، بۆ ئەم مەبەستەش دەبینین دەستی گرتوە بەسەر شۆڕشی زانیاری لە بواری زانستو مەعریفە، هەروەها شۆڕشی زانیاری لە بواری زانستی پەیوەندیو تەکنیکی بیۆلۆجیو پەرەسەندنەکان، لە سایەی ئەم شۆڕشانەدا بەجیهانیبوون گەشەی کردووە، هەرچەند وا دەبینرێت کە بەجیهانیبوون زیاتر دیاردەیەکی ئابوری بێت، بەڵام ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤی گرتۆتەوە بەتایبەتیش راگەیاندنو کولتورو پەروەردە[١٦].

---

[١٦] أ.د.محمود السيد :الهيمنة المعلوماتية و الاعلامية وآثاروها، بحث في كتاب :الدولة الوطنية وتحديات العولمة في الوطن العربي، مكتبة مدبولي، القاهرة، چ١، ٢٠٠٤،ل ١٩٥

**کولتوری ئێستا گۆڕاوەو کولتورە تەقلیدیەکەی پێشوو نیە، چونکە لەلایەك لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی نوێی ژیاندا گەشەی کردووەو چەمكو بۆچوونو دیاردەی نوێی تیادا دروست بووە، لەلایەکی تریشەوە پێشکەوتنی تەکنەلۆژی کاریگەری زۆری لەسەر پەیدا کردووەو کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەم هۆکارانە بەتایبەتیش تەکنەلۆژیای پەیوەندی، چونکە ئەم تەکنەلۆژیایە بوە بە هێزێك بۆ کولتورو لەم روەوە رۆڵێکی زۆر دەبینێت لە پێناو بڵاوبوونەوە لەسەر ئاستێکی جیهانیو چەسپاندنی هەژموونی خۆی بە شێوەیەی بەرفراوان. واتە لە ئێستادا تەکنۆلۆژیا کولتور هەڵدەگرێتو دەیگوازێتەوە هەر بۆ ئەم مەبەستەش هەر نەتەوەیەك دەتوانێت کولتورەکەی خۆی لە ئاستێکی جیهانی دا پەخش بکاتو بە گەلانی دنیای بناسێنێت، وە هەر گەلێکیش خاوەنی ئەو تەکنەلۆژیایە نەبێت هەرگیز ناتوانێت خۆی وەك خاوەن کولتورێکی بەهێز بناسێنێت یان لانی کەم بوونی خۆی بسەلمێنێت، بەڵام ئەمەش مانای وا نییە تەنها بە بوونی تەکنۆلۆژیا دەتوانرێت هێزو سەنگێکی تایبەتی بۆ ئەو کولتورە دروست بکرێت، چونکە لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت ئەو کولتورە خاوەن بنەمایەکی بەهێز بێت لەرووی مرۆییەوەو خاوەنی بەهایەکی کۆمەڵایەتی بێتو توانای خۆ نوێکردنەوەی هەست لە ئاست دیاردە نوێیەکانی ژیانی تاكو کۆمەڵدا.**

**شۆڕشی پەیوەندیو زانیاری هاوچەرخو رێکەوتنە نێودەوڵەتیەکان لە بواری سیاسەتو ئابوریو کولتور دەتوانێت جیهان بکاتە بازنەیەکی کولتوری یەکگرتوو، لەبەرئەوە کولتورە تەقلیدیەکان ناتوانن لەبەردەم ئەم کولتورە نوێیەدا خۆیان بگرن کە چەکدارە بەهۆکارە تەکنۆلۆژیەکانو چالاکی وای هەیە کە توانای چوونە ناوەوەی هەیە بۆناو کولتورەکانی تر[١٧]**

[١٧] جیهان سلیم:عولمة الثقافة واستراتجیات التعامل معها، – **سەچاوەی پێشوو**، ل١٣١

لەكاتێكـدا هــەرجۆرێك لــە جۆرەكـانی تــەكنۆلۆژیا كـە پێـی دەوترێـت دەسـتكەوتی شارسـتانی لـە شـوێنێكەوە دەگوازرێتـەوە بـۆ شـوێنێكی تـر، لەگـەڵ خۆیـدا كولتـوری ئـەو نەتەوەیـەش دەگوازێتـەوە، كـە بریتیـە لـە تایبەتمەندیـەكانو كولتـوری لۆكـاڵی، لەبەرئـەوە مامەڵـەكردن لەگـەڵ هـەر جۆرێكی نویٚ لە بەرهەمی تەكنۆلۆژی، بەجۆرێك لـە جۆرەكـان مامەڵەكردنـە لەگەڵ فەلسەفەی ژیانی ئـەو دەوڵەتـەی كـە لێـی هـاتووەو پاشـان هـەوڵیش دەدرێت كە تێهەڵكێش بكرێت لەگەڵ كولتورە لۆكاڵیەكەدا. (لەبەرئـەوە ئـەم تەكنۆلۆژیا نوێیە ژینگەیەكی باش ئامادە دەكـات بـۆ گەشـەكردنی كولتـورە جیهانیەكە هەتا گەشەی تیا بكاتو دواجاریش جێگە بە كولتـورە لۆكاڵیەكـە لێژ بكاتو لـەم كاتەشـدا لای تـاك جۆرێـك لـە دولیزمـەی كولتـوری دروسـت دەبێت، كە دواجار كۆتایی بە كولتورە لۆكاڵیەكە دەهێنێت)[١٨].

جـەنگی بـەجیهانیبوون بـە شـێوەی ململانێیـەكی تونـد بـەڕێوە دەچـێت، هەریەكەو جۆرە هەڵوێستێكی هەیە، هەریەكەیان لـەم جەنگـەدا چـەكی تایبـەتی خـۆی بـەكار دەهێنێـت، لـە راگەیانـدنو زانیـاریو هـەژموون پەیـداكردن بەسـەر وێنـەدا، كـە بـەبیٚ هـیچ شـتێك خـۆی دەگەیەنێتـە مێـشك. هەنـدێك كـەس ئـەم سـەرمایەداریەی ئێـستا نـاو دەنێـت (سـەرمایەداری زانیـاری)، ئـەویش بـەهۆی پێكـەوە گرێـدانی سـەرمایەو راگەیاندنەوەیـە لـە پێنـاو سـەپاندنی ئـەو یاسـاو سیستمەی كە ئێستا لە ئارادایە، كـە وەك ناسـنامەیەك وایـە، هەڵگرەكـەی پێـی دەچێتە ناو كرۆكی شارستانیەتە نوێیەكە بۆ باوەڕ پێهێنانو كۆنترۆڵ كردن یـان بەكارهێنانی هێزی ماددی ئەگەر پێویستی كرد[١٩]. زانیاری فیكـر بـە رەگـەزی

---

[١٨] هەمان سەرچاوە،ص١٢٩

[١٩] احمد جابر:مركزية العولمة،مجلة شؤون الأوسط،مركز الدراسات الاستراتيجية، ع/١١٣،شتاء، ٢٠٠٤

سـەرەکی دادەنرێـت لـە تـەکنۆلۆژیای نوێـدا، وە ڕۆڵـی خـۆی دەبینێـت لـە دروستکردنی یەکێك لـە بنـەماکانی بـەجیهانیبوون، هـەروەك لـە پێشتریـشدا روونمان کردەوە، بـە جیهـانی بـوون یەکـەمین هێـزی بنەڕەتیـە لـە پاڵنـانو گواستنەوەی زانیاریەکانو فیکر لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر[٢٠].

بەرەوپێش چوونە بەردەوامەکان لـە بـواری تـەکنۆلۆژیاو بـەردەوام داهێنـانی ئامێری نوێ لە بواری پەیوەندیدا، بوەتە هـۆی ئـەوەی کـە ڕێگـەکان پەیوەنـدی نێــوان تاکــەکانو خێزانــەکانو دامــەزراوەکان ئاســانتر بکــاتو زانیاریــەکان بەشێوەیەکی باشترو خێرا بگوازرێتەوە. ئەمە لەلایەك بەهۆی پەیدابوونی جـۆری باشی ئامێرەکان، لەلایەکی تریشەوە هەرزانی نرخەکـەی زیـاتر وای کـردووە کـە ئەم ئامێرانە زیاتر بچنە ناو ژیانی تاکـەکانو دامـەزراوەکان، لەلایـەکی تریـشەوە ڕۆژبەڕۆژ ژمارەی بەکارهێنەرەکانی زۆربن، هەر بۆ ئەم مەبەستەش دەبیـنین لـە بـواری ئینتــەرنێت، ڕۆژبـەڕۆژ پێـشکەوتنی گـەورەتر بەدەسـت دێـتو بەرنامـەی پێشکەوتوتر دادەنرێتو ئاستی بەشداربوان لەسـەر ئاسـتی جیهـانیش ڕۆژبـەڕۆژ لــە زیادبووندایــە، هــەروەها لــە بــواری مــانگی دەســتکردو کاریگــەری لەســەر بەرەوپێش بردنی سەتەلایتو زیادبوونی کەناڵـە فەزاییـەکانو جـۆر جـۆر بـوونی کەناڵەکانو گواستنەوەی بە لێشاوی زانیاری، ئەمـەش کاریگـەری زیـاترکردووەو زیاتر پەیوەندیە جیهانیەکان لە بواری کولتـورو هونـەرو شارسـتانیەتەوە ئاسـان کردووە.

ئەو وڵاتانەی کە ئێستا بە سەرچاوەی بەرهەمهێنانی تەکنۆلۆژی دادەنرێن دەیانەوێت ئەم مەسەلەیە پەیوەست بکەنەوە بە جۆرێك لـە بـەجیهانیبوونو پەیوەندیەك لە نێوان فیکرو تەکنۆلۆژیادا دروست بکەن، بەمەش بە جیهـانی

---

[٢٠] د.نجاح کاظم:العرب وعصر العولمة، **سەچاوەی پێشوو**، ل١٥٧

بوون بارگاوی دەبێتـەوە بـە ئایدیۆلۆژیایـەکی نـوێ کـە لـە شـوێنێکەوە بـۆ شوێنێکی تـر گـۆڕانی بەسـەردا دێـت، چـونکە لـەو ڕێگەیـەوە ئەمـە دەبێتـە کەناڵێك بۆ پـەخشی کولتورو جیهانبینیو ئاینو شارستانیەتێکی تایبـەت کـە لەسەر حسابی هەمان شتی بەرامبەرەکانە .

"ئێستا ئەمریکا دەیەوێت بەجیهانیبوون کۆنترۆڵ بکـاتو کاریگەریـەکانی خۆی لە ئەم ڕێگەیەوە دەربېڕێت، لە ئێستادا جیهانگەرایی وەك دیاردەیەکی مێژوویی بـەهۆی شۆڕشـی پـەیوەنـدیو بازدانـە ژمارەییەکانـەوە روو دەدات. ئەمریکا لەم کاتەدا ئەوە وەك بازاڕێك دەکاتو وەك بەڵێندەر مامەڵە دەکاتو دەیەوێت دەستی بەسەردا بگرێتو بە ئـەمریکایی بکـات، وەك ئـەوەی ئەمـە کۆمپانیایەکی ئابوری بێتو قابیلی تایبەتمەند کردن بێت"[21] .

ئەمریکا دەیویـست لـە سـەدەی بیـستو یەکیـشدا وەك سـەدەی ٢٠ بـاڵا دەستی خۆی بپارێزێتو وەك تەنها هێزێکی کولتوری لە جیهاندا بمێنێتەوە، وای لـە قەڵـەم دەدا کـە بـەهۆی ئـەوەی توانیویـەتی کـۆنترۆڵی سەرچـاوەی دارایيو تەکنۆلۆژی جیهـان بکـات، ئـەوا لـە بـوارە کولتوریەکەشـدا هـەر بـە سەرکەوتویی دەمێنێتەوە. بەڵام ئەمریکا لەبەرئەوەی نـەیتوانی کـار لەسـەر چەسپاندنی روە مرۆییەکەی لیبرالیـزم بکـاتو دیموکراسـیەتێکی راسـتەقینە پیادە بکاتو بەیەکچاو سـەیری بـەها مرۆییـەکان بکـات بـۆ گـەلانی جیهـان، جـارێکی تـریش لـە بـواری بـە جیهـانی بوونـدا وەك ئیمپریـالیزمێکی نـوێ دەرکەوتەوە. لەبەرئەوە بەپێی زۆر راپرسی کە لە دەرەوەی ئەمریکا ئەنجام دراوە، ئێـستا ئـەمریکا هێزێکـی خۆشەویـست نییـە لـە بۆچـوونی گەلـە نارۆژئاواییـەکانو تەنانـەت ئەوروپیەکانیـشدا. لـە رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتو

[21] إدريس هاني:المفارقة و المعانقة، سەچاوەی پێشوو، ل٥٥

وڵاتانی ئیسلامیشدا ئێستا ئـەمریکا هێزێکـە خەریکـە هـەموو دەمامکـەکانی لەسـەر دادەماڵرێـتو وەك خـۆی دەناسـرێت، شکستیـشی لـە داگیرکردنـی عێراقو ئەفغانستانو دانەمەزراندنی سیستمێکی دیموکراسی کە ببێتە نموونە لە ناوچەکەدا، بە تەواوی ئامانجی ئەمریکاییەکانی روون کردەوەو ئـەمریکای وەك هێزێکی پراگماتی ناساند، لەبەرئەوە لـە ئێـستادا دەبینیـت رابـوونێکی بەرفراوان هەیە کە ئەمەش زۆربەی گەلانی ناوچەکەی گرتۆتـەوەو بـە شـوێن دیاریکردنەوەی سەرلەنوێی شوناسی خۆیانـدان. شۆڕشـی گـەلانی عـەرەبیو کەوتنی رژێمە پاشکۆکانی ئەمریکاو رۆژئـاواو دەنگـدانی جـەماوەر بـە هێـزە ئیسلامیەکان ئەو راستیەی سەلماند، لەبەرئەوە لەدوای ئەم رووداوانەوە ئیتر ئـەمریکا لـە پاشەکـشەدایەو دەبێـت لەگـەڵ بارودۆخـە نوێیەکـەدا خـۆی بگوجێنێت.یان دەبێت کارێـك بکـات کـە بارودۆخەکـە بگێڕێتـەوە بـۆ دۆخـی پێـشوو هـەتا جـارێکی تـر کـۆنترۆڵی سیاسـەتی ئـەم وڵاتانـە بکاتـەوە، پشتیوانی ئەمریکاش بۆ کودەتاکەی میسر ئەو راستیە دەسەلمێنێت .

ئێستا تۆڕەکانی ئینتـەرنێت فـراوانترین تۆڕەکـانی پەیوەنـدی جیهـانین، ریشەی ئـەم تـۆڕە دەگەڕێتـەوە بـۆ هەوڵـەکانی ئـەمریکا لـە سـاڵی ١٩٦٩، بۆئەوەی کە تۆڕێك دروسـت بکـات کـە بـە دزییـەوە هەنـدێك لـە گروپـەکانو سـەنتەرەکانی لێکۆڵینــەوە بەیەکـەوە پەیوەسـت بکـات، بـۆ دابینکردنـی پەیوەندی لە نێوان شارەزایانو سەرچاوەکانی بڕیـاری سـەربازیو سیاسـیی لە کاتی ئەگەری سەرهەڵدانی هەر جەنگێکی ئـەتۆمی کـە رووبـدات، لـەدوای ئەوەوە ئیتر ئەم تۆڕە گوازرایەوە بۆ بـواری گـشتیو لەسـەر ئاسـتی هـەموو

ولاّتانی جیهان بلاّوبووەوە، ئەگەری ئـەوەش هەیـە کـە لـە ماوەیـەکی نزیکـدا ژمارەی بەکارهێنەران بگاتە زیاتر لە ملیارێك کەس[٢٢]:

لەگـەڵ بـەرەوپێش چـوونو بلاّوبوونـەوەی ئینتەرنێتـدا هۆکـانی تـریش گەشەیان کرد، لێرەشەوە دەتـوانین بڵـێین کۆمەڵگـەکان دەبنـە دوو گـروپ، گروپێکی خاوەن پـسپۆڕیو شـارەزاو هـەڵگری پـەیامی فیکـریو سیاسـیی، لەگەڵ زۆرینەیەکی بەکاربەرو بازاڕی، ئەوانەی کـە هـەڵگری فیکـرو کولتـورو ئایدیۆلۆژیان، دەیانەوێت ئەمە بکەنە گۆڕەپانی ململانێو یەکلایی کردنەوەی کێـشەکان، یـان سـەرکەوتن لــە ململانــێ سیاسـیـیو کلتوریەکانــدا. ئــەو کەمینەیەی کە کۆنترۆڵی گۆڕەپانەکە دەکات هەڵگری ئامانجی تایبەتیەو لـە ئەم رێگەیەشەوە خۆی نمایش دەکاتو بەرامبەرەکان لاواز دەکاتو دەیەوێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. ئەم ململانێ جیهانیە نوێیەی کـە لـە ئارادایـە، باری کۆمەڵایەتی گروپەکانی لەروی پێگەی ستراتیجیو سەرچاوە داراییەکان دیاری دەکات، هەروەها ئەو مەرکەزیەتەی کە هەیـەتی بـۆ دەسـت بەسـەردا گرتنی سەرچاوەی داراییو تۆڕەکانی شۆڕشی تەکنۆلۆژیو زانـستی، ئەمانـە هـەموویان گـرەنتین بـۆ سـەرکردایەتی کردنـی جیهـانو خـستنەژێر دەسـتی بڕیارە نێودەوڵەتیەکان، هەروەها لەدوای ئەوەشەوە دابینکردنی بوارەکان بۆ سەرکەوتنی تەکنۆلۆژیو زانستیو ئابوری[٢٣].

لــەژێر سـایەی ئــەم بەجیهانیبوونــەدا سـەرکەوتن تــەنها بـۆ ولاّتــە دەوڵەمەندەکان دەبێت، بەتایبـەتیش وولاّتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا، کـە ئەمەش هەمووی لەسەر حسابی ولاّتانی هەژارو تازەپێگەیشتووە، بـەم پێیـە

---

(٢٢) د.السيد ولد اباه: اتجاهات العولمة، سەچاوەی پێشوو ل٩

(٢٣) د.برهان غليون،سمير امين:ثقافة العولمة وعولمة الثقافة، سەچاوەی پێشوو، ل٣٩

**ئەم شۆڕشە لە دەستی ژمارەیەك لە خاوەن سەرمایە گەورەكاندا دەبێت، لەلایەكی ترەوە ئەگەر سەرنج بدەین كە شۆڕشی مەعریفیو پەیوەندیەكانو خێرایی گەشەی كولتوری بوەتە هۆی زیادبوونی بەرهەم، ئەوەی كە ئێستا فەرمانڕەوایەتی جیهان دەكات هێزی زانیاریو مەعریفەیە، لە ئێستادا ئابوری جیهانی گۆڕاوە بۆ ئابوریەك كە پشت بە مەعریفە دەبەستێت، ئەمە لەدوای ئەوەی كە ئابوریەك بوو پشتی دەبەست بە شێوازێكی چڕی سەرمایەو بەكارهێنانی چڕی كرێكار، ئەم حاڵەتەی ئێستاش بەهۆی شۆڕشی زانیاریو هۆكارە جۆربەجۆرەكانی كولتوریەوەیە[٢٤].**

**هەژموونی زانیاری ڕێگەخۆشكەر بوو بۆ هەژموونی كولتوری لە ڕۆژئاوادا، بەم هۆیەشەوە كولتورو شارستانیەت لە ڕۆژئاوادا پەیوەست كرانەوە بە یەكترەوە، هەر لەم ڕێگەیەشەوە هەموو پێشكەوتنە شارستانیەكانیان پەیوەست كردەوە بە كولتوری ڕۆژئاواوە. بەم هۆیەشەوە جۆرێك لە هەژموونی جیهانی دروست كرا بەهۆی كولتورەوە لەژێر سایەی بەجیهانیبووندا. لەم ڕێگەیەشەوە كولتوری ڕۆژئاوایی بوە كولتوری باڵا دەستو كولتورەكانی تریش خرانە پلەكانی ترەوە. ئەمەش دروستكردنی وێنەیەك بوو لەلای تاكی گەلانی نارۆژئاوایی كە سەرچاوەی هەموو پێشكەوتنێك دەگەڕێنێتەوە بۆ كولتوری ڕۆژئاوا، هەر گەلێكیش كە بیەوێت بەرەو پێش بچێت سەرەتا دەبێت پرسیار لەسەر كولتورە لۆكاڵیەكەی دروست بكات.**

**هەندێك لە توێژەرانی ڕۆژئاوایی یەكێك لە مەترسیەكانی بەجیهانیبوونی كولتور لەسەر زمانی نەتەوەیی دەبینن، ئینتەرنێت كە ڕێگەی ئاسان كردووە**

---

[٢٤] ا.د.محمود السيد : الهيمنة المعلوماتية و الاعلامية و آثارها، **سەچاوەی پێشوو**، ل٦٩٦

بۆ گواستنەوەی زانیاریەکان، لە هەمانکاتدا رێگەیەکیشە بۆ گواستنەوەی زۆر فیکری سووکو هەڵەش، هەروەها جۆرەها گرێبەستی دارایی کە دژە بە دابینکردنی ئارامیو بڵاوبوونەوەی بازرگانی مادده هۆشبەرەکان، هۆکاری تاڵانو دزیو پێشێلکردنی ژیانی تایبەتی، هەروەها شۆڕشی بیۆلۆجی کاریگەری خراپی کردۆتە سەر ژیانی مرۆڤو مەترسی دروست کردووە لەسەر خواردنو تەندروستیو پێکهاتەی سایکۆلۆژیو جەستەیی[٢٥].

یەکێکی تر لەو بوارانەی کە رەهەندێکی بەجیهانیبوونی هەیە بریتییە لە پێشکەوتنە زانستیەکان، هەرچەند پێشکەوتنە زانستییەکان رۆڵێکی گەورەیان بینیوە لە باشکردنی رەوشی ژیانو ئاسانکردنی مامەڵەو کردنەوەی بەشێك لە نهێنیەکانی ژیان بۆ مرۆڤ، بەڵام لە روویەکی ترەوە ئەگەر سەیر بکەین، زانستیش بەجۆرێك لە جۆرەکان سوودی لێوەرگیراوە بۆئەوەی لەلایەن کۆمەڵێك لە کۆمپانیاو بازرگانەکانەوە ئیستغلال بکرێت. لە پێناو بەدەستهێنانی قازانج لەسەر حسابی تەندروستی گشتی کە ئەمەش ئەمرۆ شتێکە هەڕەشەی گەورەی دروست کردووە لەسەر باری تەندروستی تاکەکان، چونکە بەبێ رەچاوکردنی ئاسایشی دروستی کۆمپانیاکان بەرهەمی نوێ دەخەنە بازاڕ بەبێ رەچاوکردنی کوالێتیو بواری دروستی، ئەمەش بە ئاشکرا لە بواری پێشکەوتنی بایلۆجیدا دەبینرێت کە تایبەتە بە (جینەکان). ئەم پێشکەوتنە لەلایەن کۆمەڵێك لە کۆمپانیاو حکومەتەکانەوە ئیستغلال کراوە، بۆئەوەی لە بواری بەرهەم هێنانی کشوکاڵیو ئاژەڵیدا بەکاربێت بۆ زیادکردنی بەرهەم بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر کە قازانجێکی بێ سنور دەست دەخات، بەڵام ئەم قازانجە لەسەر حسابی تەندروستی مرۆڤەکانو

---

[٢٥] هەمان سەرچاوە

نەوەی داهاتووە، چونکە ئەو لایەنانە هەموو شتێك بەکاردەهێنن لە ماددەی کیمیـایی‌و پاشـەڕۆکی ئـاژەڵ، سـەرەڕای ئـەوەی کـە جۆرێـك لـە عەلـەف بـەکاردەهێنن کـە هۆکـاری شـێتی مانگـابوو، هـەروەها مـاددەی یوکـسین بەکاردەهێنن کە هۆکاری ژەهراوی بوونی مریشکە.

جۆزیـە بۆفیـە (کـە ئێـستا بووەتـە سـەرکردەی هـەموو ئەوانـەی دژی بـە ئـەمریکایی بـوون دەوەسـتنەوە لـە جیهانـدا) دەڵێـت: ماوەیەکـە لافاوەکـە گەیشتۆتە قورقوڕاگە، خواردنی خراپ هەموو دەوروبەرمانی تـەنیوە، سـەیرکەن چـۆن بـە ئاسانی دەڕواتـە سـکی منداڵـەکانمان، بـە واتایـەکی تـر بیڵـێم، ئێستا بـەهۆی بـوونی مانگـا شـێتەکان‌و گۆشـتی گەشـەکردو و کۆکـاکۆلای سـاختەو پرۆسـەی دەسـتکاریکردنی جینـەکان، کـەسمان دڵنیـا نـین ئـەو شـتەی کـە دەیکەینە سکمانەوە چییە؟ بۆفیە جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئـەم مەترسـیە لـە خـۆراك وەك پەتایـەکی لێهـاتووە، کـە بێگومـان لـە فەرەنـساشەوە دەچـێتە ئەوروپا، هەروەها زەریای ئەتڵەسی دەبڕێت‌و دەگاتە هەموو جیهان(٢٦).

وڵاتانی ڕۆژئاوا بەو هەموو پێشکەوتنە تـەکنۆلۆژی‌و دروسـتی‌و کۆنترۆڵـە توندەی کە هەیانە لە بواری خۆراك‌و هاوردەکردنی شمەك‌و چاودێری بـواری تەندروسـتی – لـە ئێـستادا ڕۆشـنبیران‌و ڕۆژنامەنووسـەکان لـە ڕێگـەی نووسینەکانیانەوە ئـەو ترسـە ناشـارنەوە، کـە خـۆراك سەرچـاوەیەکی تـری مەترسییە لەسەر ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگەو داوای ئەوە دەکەن کە حکومەت چاودێری توندتر بکات‌و نەهێڵێت بەناوی زانستەوە کۆمپانیـا چاوچـنۆکەکان ژیانی خەڵك بخەنە مەترسیەوە، بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین لـە وڵاتێکـی وەك عێـراق‌و کوردسـتان بەتایبـەتی ئـەم مەترسـیە زۆر بـەخراپتر هەسـتی

(٢٦) د.سعيد اللاوندي:بدائل العولمة، سەچاوەی پێشوو، ل٤٩

پێدەکرێتو بەواقعیش کاریگەری خراپ لەسەر ژیانی هاوڵاتیان دروست کردووە، چونکە رۆژانە ئێمە دەبینین دەزگاکانی راگەیاندنو دەزگا بەرپرسەکان گرتنی سەدان تەن لە دەرمانو خۆراکی ماوە بەسەرچوو رادەگەیەنن، بەڵام کەس ناگیرێتو کەس نادرێتە دادگا، لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە کە تەنها ئەوەندەی دەگیرێت رادەگەیەنرێت.

ئەی ئەوەی کە نەگیراوەو رانەگەیەنراوە چەندە؟ کەواتە بە درێژایی ٢٠ ساڵی رابردوو لەوکاتەوە کە دەسەڵاتی سیاسیی کەوتۆتە دەست کورد، کورد لە رێگەی خۆراکو دەرمانی ماوە بەسەرچوو جۆرەها گۆشتی ناتەندروستو بەهۆرمۆن دروست کراو دانیشتوانی هەرێمی کوردستان لەو جۆرە خۆراکو دەرمانانەیان بە گەروودا دەکرێتو لە ئێستاشدا شوێنکارە خراپەکانی دەرکەوتووە لە جۆرەها نەخۆشی مەترسیدار کە لەوەوپێش نەبووە بەتایبەتیش بەرزبوونەوەی رێژەی نەخۆشی شێرپەنجەو نەخۆشیە درێژخایەنەکانی وەك شەکرەو فشاری خوێنو کۆلسترۆڵو گورچیلەو چەندان نەخۆشی تر. مەترسیەکە لەوەدایە هەتا ئێستا حکومەت هەستی بە ئەم مەترسیە نەکردووەو پەرلەمانیش بێدەنگەو سەندیکای پزیشکانیش هەڵوێستێکیان نییەو رۆژانەش ئاشکراکردنی رێژەی ئەو کەلوپەلە بەسەرچوانە بەردەوامەو ئاستەکە لە بەرزبوونەوەدایە، لەبەرئەوە بۆ کوردستانێکی لەو جۆرە ئەم مەترسیە زۆر گەورەیەو سەرەتا بە فیتی باندەکانی ناوخۆ دووەم جاریش وەك پلانێکی دەرەکی ئەم جۆرە خۆراکانە بوونە هەڕەشەیەکی جدی بۆسەر تەندروستی تاکەکانی ئەم هەرێمەو دواجاریش دەتوانن ناوی بنێین بە پرۆسەی ئەنفالی نوێ لە کوردستاندا.

## دووەم :داگیرکاری نوێی بواری کولتور

داگیرکـاری کولتـوری تەقلیـدی، لەگـەڵ هێرشــی داگیرکـاری ســەربازی ڕۆژئاواییەکانـدا هـات بـۆ وڵاتـانی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت، گوتـاری کولتـوری ڕۆژئاوایی ڕەنگدانەوەی ئەو هێـزە سـەربازیەبوو کـە بـۆ داگیرکـردن بـەکاری دەهێنا، واتە چـۆن لـە بـواری سـەربازیدا خـۆی بەسـەرکەوتوو دەزانـی ئـەم گوتـارە دەچـووە نـاو کولتـوریشو کولتورەکـەو شارستانیەتەکەشـی هـەر بەســـەرکەوتوو لەقەڵـــەم دەدا، لەبەرئـــەوە مامەڵـــەی لەگـــەڵ گەلـــە ژێرکەوتووەکاندا بەوشێوەیە بوو کە کولتور و ئاینو مێژووی ئەوان لە ئاسـت ئەم بـاڵا دەسـتیە شارسـتانیەدا نـینو دواجـار دەبێـت ئـەوان دەسـتبەرداری کولتورەکانیـان بـبنو بکەونـە ژێـر قەڵـەمڕەوی کولتـورە سـەرکەوتووەکە. "ئەمەش هەوڵەکانی مرۆڤی ڕۆژئاوایی بوو بۆ ئەوەی کە ئەزموونەکەی خـۆی فــەرز بکـات بەســەر ئــەزموونی گەلانـدا"[٢٧]. هـۆی زاڵ بـوونی کولتــورە ڕۆژئاواییەکەش لەلایەکەوە پەیوەست بوو بە ئەو شکستە دەرونیـەی کـە بـۆ گەلە ژێردەستەکان دروست بوو بوو، لەلایەکی تریشەوە سەندنەوەی هـەموو توانایــەکی ئــابوریو سیاسـیی بـوو لـە ئـەو گەلانـەو سـەپاندنی کولتـورە ڕۆژئاواییەکە بوو بەسەریاندا.

---

[٢٧] د.عبدالوهاب المسيري:اشكالية التحيز،رؤية معرفية ودعوة للاجتهاد،فرجينيا،usa،المعهد العــالمي للفكــر الإسلامي،چ١، ١٩٩٦،ص٣.

لـەم بارەیـەوە ئـیبن خەلـدون دەڵێـت "ژێرکـەوتوو بـەردەوام دەکەوێتـە ژێـر کاریگـەری سـەرکەوتوو، ئـەویش لـە دروشـمو جـلو بـەرگو ئـەخلاقو هـەموو بارودۆخەکانی ژیـان رەنگدەداتـەوە، ئەمـەش بـەهۆی ئەوەوەیـە چـونکە لایـەنی سەرکەوتووبە تەواو سەیر دەکرێ و هەرکەس سـەربکەوێت روو لـەو دەکـەن"[٢٨]

بـەپێی ئـەم بۆچـوونە، کولتـوری تـاکی ژێرکـەوتوو دەکەوێتـە ژێـر کاریگـەری کولتـوری سـەرکەوتوو، لـەم رێگەیەشـەوە سـایکۆلۆژیەتێکی ژێرکەوتوانـەی بـۆ دروســت دەبێــت، چــونکە لـــەم کاتـــەدا ئەوکەســـە ژێرکــەوتووە وادەزانێــت سەرکەوتنی ئەوانی تر دەگەڕێتەوە بـۆ کولتـورو عەقڵیـەتو زیرەکـی ئـەوان، بـە پێـچەوانەشەوە ژێرکـەوتنی خـۆی دەگەڕێنێتـەوە بـۆ دواکـەوتوویی کولتـوریو لاوازی تێگەیشتن لـە ژیـان، بـە ئـەم هۆیـەوە ئێمـە بینیمـان کـە لـە سـەردەمی داگیرکـاری زلهێزەکانـدا دەسـتەیەك لـە رونـاکبیرو رۆشـنبیر دروسـت بـوون. کـە کەوتنــە شــوێن کولتــوری ئــەوان، لــە بەرامبەریــشدا دەســتیان دایــە دژایــەتی کولتــوری رەســەنی خۆیــانو مێــژوو شارســتانیەتو ئاینەکــەیان، لــەم رووەوە ئـــەوەی پێـــشتر رۆژهەڵاتناســـان دەیاننوســـی لەســـەر کولتـــورو مێـــژوو و شارستانیەتی گەلە داگیرکراوەکان، دواجار ئەم نوخبە نوێیە بوونە هەڵگری ئـەم گوتـارەو لەسـەر هـەمان پرۆگـرام کاریـان کـرد، ئـەم نوخبـە رۆشـنبیرە دواجـار لەگەڵ گەڕانەوەی هێزە ئیمپریالیزمەکانیش بوونە پاڵپشتی ئەو هێزانەی کە لـەم وڵاتانـەدا دەسـەڵاتیان بەدەسـتەوە گـرت کـە سـەرئەنجام هـەموویان بوونـەوە ئیمپریـــالیزمێکی تـــر، بـــە بـــەرگی خۆمـــاڵیو دەســـتیان دایـــە تـــاکڕەویو عەسـکەرتاریەتو سـەرکوتکردنی ئـازادیو لـە بەرامبـەر هـەموو ئـەم رەوشـە

---

[٢٨] عبدالرحمن بن خلدون:المقدمة،بيروت،دار الكتاب اللبناني،١٩٨٢،ل٢٥٨-٢٥٩

نالەبارەشدا ئەو رۆشنبیرانە هەڵوێستێکیان نەبوو، بەڵکو زۆرجار شەرعیەتیان دەدا بە سەرکوتکردنی هێزە ئازادیخوازەکان.

رۆژهەڵاتناسێك بەناوی (هاملتون جیب) دەڵێت (بەهۆی چالاکیەکانیان لە بواری فێرکردنو کولتوریدا لە رێگەی قوتابخانە هاوچەرخەکانو رۆژنامەوە، دەیانەوێت لەناو مسوڵماناندا نەوەیەك دروست بکەن، هەرچەند لە رێگەی بێ ئاگاییشەوە بێت، بەڵام لە رواڵەتدا بێ دین دەربکەون، ئەمەش باشترین بەرهەمی هەوڵەکانی رۆژئاوابوو بۆ ئەوەی جیهانی ئیسلامی بێ بەش بکەن لە شارستانیەتەکەیان)[٢٩].

لەپێناو زاڵکردنی کولتوری رۆژئاوایی، هێزە رۆژئاواییەکان بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدابوون کە لە رێگەی جۆرەها پرۆسەی جیاوازەوە جۆرێك لە قەناعەتو رەزامەندی دروست بکەن بەرامبەر بەدیدو جیهانبینی رۆژئاوایی بۆ سیاسەتو ئابوریو هەموو کایەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، لەبەرئەوە ئەو هۆکارانە لەگەڵ گۆڕانی زەمەندا دەگۆڕێنو لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیاشدا هۆکاری نوێو ئالیەتی نوێ بەکار دێن بۆ ئەو مەبەستە، لەم دۆخەی ئێستاو لە رابردووشدا پرۆسەیەك بەکار دێت لەلایەن رۆژئاواییەکانەوە کە پێی دەوترێت (دروستکردنەوەی رەوشتی People shaping)، ئەمەش کۆمەڵە هەوڵێکی بەرنامە بۆ کێشراون بۆ هەژموون پەیداکردن بەسەر عەقڵی مرۆڤەکانو یاریکردن پێیان، پاشان سەرکردایەتی کردنو ئاراستەکردنی بۆ کۆمەڵێك ئامانجی دیاریکراو، کە پێشتر بەرنامەی بۆ کێشراوە، ئەمەش دوای ئەوە دێت کە لە هەموو دیدو بۆچوونو جیهانبینیە پێشووەکان دادەبڕێت.

---

[٢٩] انور جندي:من التبعية إلى الأصالة،طبعة دار الأعتصام،القاهرة،١٩٧٧،ل١٣٢

(جۆرج بلاندیه) لێکۆڵەری فەرەنسی حاڵەتی داگیرکاری ئیمپریالیزمی بەم شێوەیە دەردەبڕێت:

هەژموونی کەمینەیەکی بێگانەیە لەژێر دروشمی باڵادەستی کۆمەڵایەتیو نەتەوەییو کولتوریە بەسەر زۆرینەیەك لە خەڵك، کە جیاوازن لەروی رەگەزیو کولتوریەوە، ژێرخانێکی مادی لاوازیان هەیە، لەروی پەیوەندی شارستانیەوە نەگونجاون بەیەکەوە، تێڕوانینەکانیان لە روانگەی شارستانیەتێکی پیشەسازیە کە خاوەنی ئابوریەکی مەدەنیو بەهێزە.. ئەمەش لە بەرامبەر شارستانیەتێکی دواکەوتووی بێ تەکنەلۆژیاو ئابوریەکی دواکەوتوو[٣٠].

لە ئێستاشداو لە سەردەمی بەجیهانیبووندا. هێزە رۆژئاواییەکان هەمان سیاسەتی داگیرکاریان هەیە لە بوارەکانی کولتور ئابوریو سیاسیدا. بەڵام لە ئێستادا بە شێوازێکی نوێو بەکارهێنانی هۆکاری نوێیەکانە، کە لە رێگەی رۆژهەڵاتناسە نوێیەکانەوە ئەنجام دەدرێت.

لە ئەمڕۆدا ئەمریکا دەیەوێت لە رێگەی ئەو پێشکەوتنە ئابوریو تەکنۆلۆژیو شارستانیەی کە هەیەتی، بەجیهانیبوون بکات، بە جۆرێك لە بە ئەمریکایی بوون ئەویش لە رێگای:

١- هەژموون پەیداکردن بەسەر کولتورەکانی ترو پوچکردنەوەیان.

٢- تواندنەوەی کولتورە بچوکەکانو سڕینەوەی تایبەتمەندیەکانو شوناسەکان.

---

[٣٠] مجيد محمود عليلو :علم الأجتماعي الغزو الثقافي،
www. e– resaneh.com/Arabic/seghafah/elm%20ejtema.htm-67k

٣- دروستكردنى فەزايەكى ناكولتورى(٣١).

كولتورى بە ئـەمريكايى بـوون لـە ئێستادا يەكێكـە لـەو كولتورانـەى كـە مەترسـى هەيـە بۆسـەر كولتـورە رۆژئاواييـەكانى تـر، دەيـەوێت هـەژموون بەسەرياندا پەيدا بكات لەناوخۆيدا بيانتوێنێتەوە.

ئـــەم جـــۆرە لـــە هـــەژموون پێـــى دەوترێـــت بـــە ئـــەمريكايى كـــردن Americanization بـەجيهانيبوون دەمامكێكـە بـۆ ئـەم مەبەسـتە، ئەمەش نە ئەفسانەيەكى سياسييەو نـە شـێتخانەيەكە كـە نـا تەواويـەكانى خۆمانى پێوە گرێ بدەين، ئەمە راستيەكە كـە ئـەوروپا لەگەڵيـدا دەژى، لـە ئێستادا نارەزايى لە بەرامبەردا دەردەبرێتو رۆژ بەرۆژ بەرگرى لە دژى زيـاد دەكـاتو وەك مەترسـيەكى سـتراتيجى سـەيرى دەكرێـت، كـە هەرەشـە لـە سـەربەخۆيى ئـابورىو سياسـيىو شوناسـە كولتوريەكـەى دەكـات(٣٢). بەشێوەيەكى گشتى كولتـورى رۆژئـاوايى هەرەشـەيەكى جدىو بەردەوامـە بۆسەر كولتورى گەلانى تـرى جيهـان، ئەمـەش هـەموو روەكـانى سـەربازىو سياسـيىو تـەكنيكىو كۆمەڵايـەتىو مەعنـەوى دەگرێتـەوە، وە لەگـەڵ بـەردەوام بـوونى ئـەم پرۆسـەيەداو هەسـت كردنـى گـەلان بـە گـەورەيىو مەترسـيداربوونى بـرواى گـەلانى لاواز زيـاد دەكـات بـەلاوازى تواناكـانىو كولتورەكانيـانو رۆژبـەرۆژيش مـەيلى پاشـكۆ بـوون بۆيـان زيـاد دەكـات، بۆئەوەى لاساييان بكەنـەوە لـە جلو بـەرگو خـۆراكو هـەموو شـێوازەكانى ژيانياندا، ئەمەش لەلاى تاكو كۆمەڵدا جياوازيەكى نييە(٣٣). ئەمە شێوازێكى

---

(٣١) د.باسم علي خريسان:العولمة والتحدي الثقافي، **سەچاوەى پێشوو**، ل١٥٠

(٣٢) العولمة:جدل العدوان والمقاومة الثقافيين
www.balogh.com/islam/20032nci.htm

(٣٣) غليون،د.برهان:اغتيال العقل،(المؤسسة العربية للدراسات،بيروت، ص١٣٦

نوێیە بۆ غەزوی کولتوری، کە لە هەوڵی ئەوەدایە بەهۆکاری جۆربەجۆر کولتورەکەی خۆی بڵاوبکاتەوەو خۆی بە باڵا دەست لە قەڵەم بداتو دژ بە کولتورە لۆکاڵیو نەتەوەییەکان بوەستێتەوەو بە سەرچاوەی دواکەوتوویيو نەفامی ئەو گەلانە لە قەڵەمیان بدات، لە بەرامبەریشدا ئاراستەیان بکات بۆ کولتورێکی تر، کە بەجیهانیو پێشکەوتوخوازو لێبوردەو گەشەکردوو ناوی دەباتو هەرئەمەش بە سەرچاوەی بەها مرۆییەکان لەقەڵەم دەدات، لەم رێگەیەشەوە تاکێك دروست دەکات کە لە جلو بەرگو خۆراكو شێوازەکانی ژیانیدا نامۆ دەبێت بە کولتوری تایبەتمەندو لۆکاڵیەکەی.

ئامانجی بنەڕەتی ئەم پرۆسەیە بریتییە لەوەی کە رێگە بگرێت لە بەرامبەرەکان لە بیرکردنەوەو سەرقاڵیان بکات بە کۆمەڵێك بابەتی رۆتینیو سادە یان بە گرفتەکانی رۆژانەوە، ئەویش بەهۆی نەهێشتنی ئاسایشو ئازادی یان هەژاریو نەخۆشی، چونکە ئەو هۆکارانەش بەشێکی زۆری خودی رۆژئاواییەکان خۆیانن، لەلایەك بەهۆی چاوتێبڕینیان لە سەروەتو سامانی ئەم وڵاتانەو بەتاڵان بردنی کانزا بەنرخەکانی، لەلایەکی تریشەوە پشتیوانی نەکردنی هێزە رزگاریخوازو ئازادیخوازەکانو کۆمەکی کردنی ئەوپەڕی هێزە عەسکەرتارو تاکڕەوەکان، بۆئەوەی درێژە بە دەسەڵاتەکانیان بدەنو هەتا دواهەناسەش دەست هەڵناگرێ لە کۆمەکی کردنیان، کە ئەمەشمان بەچاوی خۆمان بینی لە رژێمە هەرەس خواردوەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا.

لە رۆژگاری ئەمرۆدا، ئەو پرۆسەیە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، چونکە لە ئێستادا پشت بەوێنە دەبەستنو ئەم وێنەیەش بوەتە کولتورێکی بەکاربەری ئاسانو بەرفراوان، وە لەم رێگەیەشەوە زۆر بە ئاسانی دەتوانرێت سیستمی بەرگری سروشتی ئەم گەلانە ببڕێت، کە بەهیچ جۆرێك ئالیەتە تەقلیدیە

نوسراوەکە نەیدەتوانی ئەو رۆڵە ببینێ، سەرەڕای سیحری مەعریفیو جوانی شێوازەکەشی[٣٤].

ئەم ئامانجانەی کە دامەزراوە زەبەلاحەکانی بەجیهانیبوون دەیانەوێت رۆڵی خۆی لە واقیعی کولتوری گەلانی تردا ببینێ، بەبێ بوونی زەمینەیەکی لەبار بۆ ئەو مەبەستە ئەنجام نادرێت، چونکە ئەگەر گەلێك خاوەنی سیستمێکی سیاسیی کراوەو دیموکراسی بێتو مافەکانی هاوڵاتی دابین بکاتو لەسەر بنەمای پرۆسەیەکی گەشەپێدانی سیاسیی ئابوری کۆمەڵایەتی هەنگاو هەڵبگرێتو ئاستی ئابوریو ژیانو خوێندن تیایدا پێشکەوتووبێت، لەم کاتەدا ئەو زەمینە نارەخسێت کە ئەو ئامانجانە تیایدا سەوز ببێت.

د. محمد عابد جابری هۆکارەکانی غەزوی کولتوری بۆ کولتوری عەرەبی، دەگێڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك لەوانەش:

١- واقیعی دواکەوتوومانو ئینتیمامان بۆ لیستی دواکەوتوەکان.

٢- داگیرکردنی راگەیاندنی بینراوو بیستراو لە رێگەی هۆکارەکانی راگەیاندنەوە، کە هەڕەشە لە بەهاو ئەخلاق دەکاتو چۆتە ناو سۆزو خەیاڵی تاکەکانمان.

٣- شکستهێنان لە بەرجەستەکردنی مۆدێرنەدا، کە ئەمەش بۆتەهۆی ناتەواوی لە کردارو پلان، لەسەر هەموو ئاستەکانی زانستیو کولتوریو ئابوریو سیاسیی لەسەر ئاستی نیشتمانیو نەتەوەییو عەرەبی، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تێنەگەیشتنمانو رەزامەند نەبوونمان لەسەر بنەماکانی

---

[٣٤] د.محمد عابد الجابري:المسألة الثقافية،، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٤،ص١٩٤

شارستانیەتی هاوچەرخ بەپێی بۆچوونی د. محمد عابد جابری، ئەمە هەوڵێکی رۆژئاواییەکانە بۆ سادەکردنەوەی هۆشیاری ئەم گەلانە[٣٥].

هۆکارەکانی ئەم سەردەمە جیاوازن بۆ غەزوی کولتوری لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیاو شۆڕشی زانیاریدا، هەمو هۆکارەکان بەکاردەهێنرێن بۆئەوەی کولتوری رۆژئاوایی فەرز بکرێت بەسەر گەلانی تردا، لە روکەشدا بەشێك لە ئازادی دەبینێت لە هەڵبژاردنی ئەم کولتورە نوێیەدا، بەڵام لە راستی دا ئاراستەکان هەموو بە ئەو جۆرەن کە دواجار دەبێت ملکەچی جیهانبینی کولتورە جیهانیەکەبن، کە بنەماکەی کولتورێکی لۆکاڵی رۆژئاواییە.

لەم سەردەمە نوێیەی بەجیهانیبووندا، بە پشت بەستن بە هۆکانی پەیوەندی نوێ بەتایبەتیش ئەو زانیاریانەی لە رێگەی شاشەکانەوە پەخش دەکرێت جێگەی هۆکارە کۆنەکانی گرتۆتەوە کە لە سەدەکانی رابردوودا پشتی پێ دەبەست کە چەندان گروپی کولتوریو ئایینی دەنارد، کە لە نێویاندا سوپایەك لە لێکۆڵەرو روناکبیری بەتوانا هەبوون، هەروەها تۆڕێکی بەرفراوان لە قوتابخانەی هاوچەرخو سەنتەرو رۆژنامە، واتە دامەزراوەیەکی تەواو لە هەموو بوارەکاندا کە دەیانویست لە رێگەی دەیان گروپ لە نووسەرو رۆژنامەنووسو سیاسییو ئەکادیمیەوە زانیاریەکانیان ئاراستەی چینو توێژەکان بکەنو دەیان گروپی ئەم وڵاتانە بەرەو رۆژئاوا بەرن، بەناوی گۆڕینەوەی پسپۆڕیو تێگەیشتن لە دنیای نوێ، کە ئەمە لە راستیدا کارێکی بەسودە، بەڵام ئەوان لە گەڕانەوەیدا مرۆڤێکی مێشك شۆراوەو موتوربەکراو بە کولتورێکی تریان دەناردەوە بۆووڵاتەکەی خۆیان بە

---

[٣٥] عبد الأله بلقريز: النظام الأعلامي السمعي-والبصري الغربي والأختراق الثقافي.، بحث مقدم لندوة، (إشكالية العلاقة الثقافية مع الغرب)، مركز دراسات الوحدة العربية،بيروت،ط١ ١٩٩٧،١، ص٢٢٨

ئامـانجێکی تـر، ئـەویش هـەر ئـەو ئامانجـەبوو کـە خۆیـان دەیانویـست، بەتایبـەتیش بـۆ بەرەورووبوونـەوەی کولتـورە لۆکاڵیەکـەی خـۆی‌و بـە سـوك سەیرکردنی‌و هەوڵدان بۆ پەراوێزخستن‌و بێ ڕێزکردنی.

٤- پێشخـستنی ئێـستا بەسـەر ئایـندەدا، دەسـت گـرتن بـە ئـەو چارەسەرانەی کە لە ئێستادا هەن، سەرەڕای ئەو ناتەواویانەی کـە تێیدایـەو جارێکی تر بەرهەم هێنانـەوەی رابـردوو لەسـەر ئاسـتی ئـابوری‌و سیاسـیی‌و کۆمەلایەتی‌و فیکری ئەوەی پەیوەندی بە بواری کولتوریەوە هەیە جێهێڵراوە بۆ سیاسـەت، کـە ئـەویش سـەرکوت کـردن‌و یـەك دەنگـی پراکتیـك دەکـات ئەمەش دەنگی دامەزراوەی فەرمییە(٣٦).

سـەرەڕای ئـەوەی کـە هـەژموونی کولتـوری رۆژئـاوایی بەسـەر وڵاتـانی جیهانی باشور، بەشێکی زۆری لە ڕێگەی غەزوێکی میدیاییەوەیـە لـە ڕێگـەی کەناڵە فەزاییەکان‌و هۆکانی پەیوەندی هاوچەرخ (ئینتەرنێت)و ئاژانسەکانی هەواڵی‌و کتێب‌و گۆڤارو رۆژنامەکانەوەیە، هەروەها هەندێك جاریش لە ڕێگەی کۆمەڵێك ڕێکخراوی سەربە نەتەوە یەکگرتووەکان‌و وڵاتـانی رۆژئاواوەیـە کـە بەناوی گەشەپێدانی میدیای ئازادو دیموکراسـی ئـەنجام دەدرێـت، بـەڵام لـە راستیدا هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ژێرخانی پەروەردەو فێرکردن لـەو وڵاتانـەدا. چـونکە پـەروەردو فێرکـردن بنـەمای دروسـتکردنی نەوەیـەکی هۆشیارو خوێندەوارو تێگەیشتووە، کە دەبنە هەڵگری پەیام‌و ئاڵای فیکـرو کولتـورو زانـست‌و سیاسـەت‌و ئـەویتر، لەبەرئـەوە ئەگـەر دەمانـەوێت لـە وڵاتەکانماندا نەوەیەکی بە ئیرادەو خۆناس‌و هۆشیارو بـەئاگا دروسـت ببێـت

(٣٦) صادق جلال العظم:ذهنية التحريم(قبرص،مركز الأبحاث والدراسات الأشتراكية في العالم العربي، دمشق،١٩٩٧،ص١١٥-١١٦

دەبێت سەرەتا دەستکاری پرۆگرامەکانی پەروەردەو فێرکردن بکرێتو بەجۆرێك دابڕێژرێنەوە کە لەگەڵ پێشکەوتنەکانی سەردەمدا بگونجێتو هەڵگری بنەماکانی گەشەپێدان بێتو خۆی لەگەڵ کولتورە جۆربەجۆرەکاندا بگونجێنێت، هەروەها لە توانایدا هەبێت کولتوری بەکاربردن بگۆڕێت بۆ کولتوری داهێنان، چونکە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ئێمە پێویستمان بە کولتورێکی زیندووی گۆڕاوی داهێنەر هەیە، چونکە تەنها بەم شێوازە ئێمە دەتوانین روبەڕووی غەزوی کولتوری رۆژئاوا ببینەوەو لە بەردەمیدا خۆمان بگرینو خۆمان وەك ئەزموونێکی کولتوری رەسەنی جیهانی لەقەڵەم بدەینو ئەوکاتەش داوای گفتوگۆو لەیەکتر تێگەیشتنی کولتوری بکەین.

ئەگەر سەیری هەرێمی کوردستانیش بکەین وەك بەشێك لە وڵاتانی ناوچەکە بەدەست هەمان گرفتەوە دەناڵێنێت، کە ئەویش نەبوونی پرۆگرامێکی خوێندنی پێشکەوتووە، کە توانای پێگەیاندنی تاکێکی هۆشیاری پێگەیشتووی هەبێت لەرووی فیکریو کولتوریو زانسیەوە، لەبەرئەوە ئێمە لەناو گەنجانی زانکۆدا ئەوە نابینین کە نەوەیەکی هۆشیاری خاوەن کولتورێکی لۆکاڵی بن کە بە ئیرادەی ئازادی خۆیان تەعبیری لێ بکەنو ئینتیمایان هەبێت بۆی، لەبەرئەوە ئەم ناوەندانە لە جیاتی بەرهەمهێنانی کولتورێکی داهێنەر، زیاتر کولتوری پەراوێزو پاشکۆو لاواز بەرهەم دەهێنن، لەبەرئەوە لە کوردستاندا ئەوەی دەبینرێت تەنانەت لە ئاستە باڵاکانیشدا کولتوری بەکاربردنە نەك بەرهەمهێنان، کە ئەمەش مەترسی لەسەر نەوەی نوێو ئینتماو شوناسی دروست دەکاتو دواجاریش گیانی نیشتمان پەروەریو کوردایەتی لاواز دەکاتو نەوەی نوێ بە چاوێکی بێ بایەخەوە سەیری دەکات.

له پێناسەیەکی کورتدا بە ئەمریکایی کردن واتە بەگشتی کردنی شێوازی ژیانی ئەمریکی[٣٧] بەپێی بۆچوونی د. محمد عابد جابری: بەجیهانیبوون، جۆرێکە لە بە ئەمریکایی بوون، واتە بانگەشەیەکە بۆ بەجیهانی کردنی نمونە ئەمریکیەکە، لەم بارەیەوە دەڵێت بەجیهانیبوون لە راستیدا سەرەتا لەئەمریکاوە سەریهەڵداوە، بەتایبەتیش لە بواری دارایی‌و ئابوریدا، لەمەوە دەتوانین ئەوە بڵێین کە شتەکە تەنها تایبەت نییە بە ئالیەتێك لە ئالیەتەکانی پێشکەوتنی سەرمایەداری نوێ، بەڵکو کارکردنە لەسەر نمونەیەکی تایبەتی، لەبەرئەوە لێرەدا بەجیهانیبوون تەنها سیستمێکی ئابوری نییە، بەڵکو سیستمێکی ئایدیۆلۆجیشە، کە خزمەت بەم سیستمە دەکات‌و رێزی لێ دەگرێت‌و کاری بۆ دەکات، لەبەرئەوە دەبینین کە هەندێك لە نووسەران هەن کە بەراورد دەکەن لە نێوان ئەمەو بە ئەمریکایی بووندا، کە بریتییە لە بڵاوکردنەوەو گشتگیری کردنی شێوازی ئەمریکی[٣٨]

ئەمریکاییەکان بۆخۆیان دان بەو راستیەدا دەنێن کە لە رێگەی بەجیهانیبوونەوە دەیانەوێت کولتوری ئەمریکایی بە گشت جیهاندا بڵاوبکەنەوەو دواجار یەکێکی وەك فۆکۆیاماش ئەو بانگەشەیە دەکاتە کتێبی کۆتایی مێژوو، لەوێدا ئەزموونی لیبراڵی ئەمریکی دەکاتە ئەو نموونەیەی کە دەکرێت وەك دوا ئامانجی خەباتی مرۆڤایەتی لە قەڵەم بدرێت‌و بکرێتە باشترین نموونەی سەرکەوتووی ژیان‌و ئەمەش وەك مژدەیەك بە گەلانی جیهان بدرێت.

---

[٣٧] برهان غليون،سمير امين:ثقافة العولمة–عولمة الثقافة، **سەرچاوەی پێشوو**، ل٤٤

[٣٨] د. محمد عابد الجابري:قضايا في الفكر المعاصر، **سەرچاوەی پێشوو**.ل١٣٧

لەم بارەیەوە (جهینۆ دەڵێت: "ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە لە دیدو تێڕوانینی زۆربەی ئەمریکیەکاندا بەجیهانیبوون دروستبونی سنورێکی نوێیە لە جیهانی ئابوریدا، کە ئەمەش دووبارە درێژەدانە بە ئەزموونی ئەمریکی لەسەر ئاستی جیهان ئەوەش لە رێگەی فراوان بوونی پلە بە پلە لە بواری خۆیدا"[٣٩]

فەیلەسوفێکی تری وەك چۆمسکی لەو بڕوایەدایە کە بەجیهانیبوونی کولتور گواستنەوەیەکی نەوعیە لە مێژووی راگەیاندندا، کە لە رێگەیەوە هەژموونی سەنتەریەتی ئەمریکی بەسەر کەنارەکانداو پاشان بەسەر هەموو جیهاندا بەهێز دەکات[٤٠]

تۆماس فریدمان، کە یەکێکە لە تیۆرسینەکانی بەجیهانیبوون، دەڵێت: "ئێمە ئێستا لەبەردەم جەنگێکی سیاسیو شارستانی ناوخۆداین، بەجیهانیبوون واتە بە ئەمریکایی بوون، ئەمریکاش هێزێکی شێتە لەژێر دەسەلاتێکی شۆڕشگێڕی مەترسیداردایە، ئەوانەی کە دەمانترسێنن راست دەکەن، فریدمان لە کتێبێکیدا بەناوی (لوکزوسو داری زەیتون) جەخت لەوە دەکاتەوە کە بەجیهانیبوون واتە پرۆسەی بە ئەمریکایی بوون، بۆئەوەیە کە جیهان بکاتە گۆڕەپانێکی یاری بۆ ئەمریکا، پاشان دەڵێت: "ئێمەی ئەمریکی نێردراوی ئەم جیهانە خێرایەین، دی تەقلیدین، پێغەمبەری ئابوری ئازادین، هەژموونی بالا بۆ تەکنۆلۆژیای ژمارەییە، ئێمە کار دەکەین لەپێناو فراوانکردنو بلاوکردنەوەی بەهاکانمانو چێشتخانەکانی پیتزا، ئێمە

---

[٣٩] د.محسن عبدالحميد:العولمة من المنظور الإسلامي، سەچاوەی پێشوو، ل٢٦

[٤٠] وسائل وادوات الغزو الثقافي http://alkadhum.org/alfurat/29/page/makalat.htm

* محرر شؤن الخارجية في جريدة نيويورك تايمز.

داوامان له هـەموو جیهـان ئەوەیـە کـە شـوێنکاری ئێمـەیان پێـوە دیاربێـت، دیموکراسـیو سـەرمایەداری بـن، لەسـەر لێوەکانیـان بیبـسی هـەبێتو مایکرۆسۆفتیش لەسەر کۆمپیوتەرەکانیان"[٤١].

د. حسین عبدالهادی دەڵێـت: "بـە جیهـانی بـوون واتـە بەگشتی کردنـی ئەزموونی لیبڕاڵیەتی نوێ، بەتایبـەتی ئـەمریکایی، بەشـێوازەکانی ئـابوریو سیاسـییو فیکـریو کولتـوریو کۆمەڵایـەتیو ئـایینی بەسـەر هـەموو جیهاندا"[٤٢]

جۆرج بۆش له وتارێکیـدا لـە سـاڵی ١٩٩٢ دا دەڵێـت: "سـەدەی داهـاتوو سەدەی ئەمریکایە، سەرکردایەتی جیهان لە سەدەی داهـاتوودا بـۆ ئـەمریکا دەبێت، چونکە وا دەبینم کە جیهان بەبێ بەرگریو ڕێگرو هەر هێزێکی تـری زیندوو دەبێت کە ڕۆڵێکی کاریگەری لە جیهاندا هەبێت"[٤٣]

لە بەرامبەر ئەم بـە ئـەمریکایی بوونـەدا، ترسـێك دروسـت بـووە لەلایـەك لەلایـەن ئەوروپیەکانـەوە لـە توانـەوەی شوناسـە لۆکاڵیـەکانیان، لەلایـەکی تریشەوە لە بەرامبەر زاڵ کردنی کولتوری ئەمریکایی بەسەریاندا، ئەم ترسـە لەلای کولتوری گەلانی ڕۆژهەڵاتیش هەست پێ دەکرێـ، لەبەرئـەوە دەبیـنین لەسەر ئاستێکی جیهانی هێزێکی بەرفراوانی دژە ئەمریکایی لە سـەرهەڵدانو گەشەکردندایە، لە ئێستادا هەموو ئایدیۆلۆژیاو بۆچوونە فیکـریو سیاسـییو

---

[٤١] وسائل وادوات الغزو الثقافي، سەچاوەی پێشوو.

[٤٢]، د.حسين عبدالهادي :العولمة النيوليبرالية وخيارات المستقبل، مركز الراية–والتنمية الفكرية–المملكه–العربية السعودية،جدة،چ٤ ٢٠٠،١

[٤٣] صلاح المختار:دور الأختراق الثقافي في خطة السيطرة الأمريكية على العالم،بحث مقدم في ندوة /اشتكالية العلاقة الثقافية مع الغرب،بحوث ومناقشات الندوة الفكريـة التـي نظمهـا المجـع العلمـي العراقي،مركـز دراساتالوحدةالعربية،بيروت،ط١٩٩٧،١

ئابوریەکانی تر بـەرەو رووی جۆرێـك لـە نەزعـەی ئـەمریکی بوونەتـەوە (کـە لەسەر بەسەنتەرکردنی بەجیهانیبوون کار دەکات)، ئەم بە ئەمریکایی بوونـە نەفی نەیارەکان دەکاتو دوریان دەخاتـەوەو دەیانگێڕێتـەوە بـۆ (ئـەوروپای کۆن) یان بەرەو (**ئیسلامێکی کۆنی بەسەرچوو**) وە داوا لـە هـەموو جیهـان دەکات کە خۆیان نزیك بکەنەوە لە نموونە ئەمریکیە بەجیهانی بووەکـە یـان بـە تـەواوی خـۆی لێ دوور بخاتـەوە[٤٤]. لـە هـەموو بوارەکـانی سیاسـیی‌و سەربازیی‌و کولتوری، لەدوای رووخـانی دیـواری بـەرلین‌و یـەکێتی سـۆڤیەت‌و گوتەزای کۆتایی مێژوو، لیبرالیزمی سەرمایەداری رۆژئاواییان کـردە مـژدەی رزگارکردنی جیهان، ئەمریکاش خۆی بە پارێزەری دروشم‌و مافەکانی مرۆڤ لە قەڵەمـدا، (دادپـەروەریی‌و دیموکراسـیەت)، لـەم رێگەیەشـەوە خـۆی وەك پـارێزەری جـەماوەرو ژێردەسـتەکان لـە قەڵەمـداو مـژدەی خۆشـگوزەرانی‌و ئـازادیی‌و گەشـەپێدانی دا بـە گـەلانی جیهـان. **لـەم روانگەیـەوە دروشمـە ئەمریکیەکان** دەست دەکەن بە هەوڵدان بۆ تەواوکاریی‌و دابرانـی جـوگرافیی‌و هەست کردنی بەردەوام بە سـەرکەوتنی ئـەخلاقی Moral superiority وە هەوڵـدانی بـەردەوام دژی شـەڕ Crusading againsteril وە خەباتکردن لەپێناو بنیاتنانی ئیمپراتۆریەتی ئازادی.

(Crusading in the path of the empire freedom)

هەروەها هەوڵدان لە پێناو کۆماری فەزیلەتدا (Therepublicofvirtue) وە هەوڵدان بۆ رزگارکردنی جیهان[٤٥]. لەدوای ساڵەکانی نەوەدو دەرکـەوتنی

---

[٤٤] احمد جابر :مرکزیة العولمة، **سەچاوەی پێشوو.**

[٤٥] جمیل مطر:الكراهیة الأمریكیة للعرب-ضاعة جدیدة، بحث في ندوة.(صناعة الكراهیـة-فـي العلاقـات العربیة-والأمریكیة)مركز دراسات الوحدة العربیة-بیروت، چ١، ٢٠٠٣،ل٢٦٦

ئەمریکا وەك تاکە جەمسەر، لەوکاتـەوە دوالێزمـەی دروشمـەکان لـە نێـوان ناوەوەو دەرەوە دەرکەوت، لـەو کاتـەوە ئـەمریکا هەوڵـدەدا لەسـەر ئاسـتی جیهان دەست بگرێت بەسەر زۆرینەی بوارەکانی ژیان لەسەر روی زەوی، بـۆ ئەم مەبەستەش بواری بەجیهانیبوونی هەڵبژارد بۆئەوەی لـە ئـەم رێگەیـەوە جیهان بکەنە فۆتۆکۆپی ئەمریکا.

ئـەمریکا دەتوانێـت جیهـان ناچـار بکـات کـە ملیارەهـا دۆلار رەوانـەی بانکەکانی ئەمریکا بکـەن، ئـەویش لـە رێگـەی بەرزکردنـەوەی سـوەوە، کـە بانکـەکان دەیـدا بـە موشـتەریەکانی. دوای ئـەوەی ئـەو بانکانـە ئـەم پارانـە کۆدەکەنەوە لە بواری وەبەرهێناندا بەکاری دەهێنن‌و بەمەش دەبێتە مایـەی دابەزینی نرخی دۆلار لە بەرامبەر دراوەکانی تـرو بەمـەش سـوو دادەبـەزێت، نـاردەی وڵاتــە هــەژارەکان نرخیــان دادەبــەزێت‌و لــە ئەنجامــدا قــەیرانێکی ئابوری‌و مرۆیی دروست دەبێت کە تەنها سودمەند لێی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، هەتا ئەوکاتانەش کـە دۆلار دراوێکـی جیهـانی بێـت، ئـەمریکا لـە توانایـدا هەیـە کـە دەسـت بگرێـت بەسـەر سـەرمایەو ئاراسـتەی رۆیـشتن‌و بەکاربردنیـداو بەمـەش جیهـان وەك کۆیلەیـەکی لێ دێـت‌و وڵاتـان زۆر بـە دەگمەن دەتوانن پارێزگاری لە تواناو سەربەخۆییان بکەن[٤٦].

لە حاڵەتی بە ئەمریکایی بوونی جیهاندا، هەموو سلوك‌و مامەڵەو هـەڵس‌و کـەوت‌و حـەزو ویـستەکانی ئـەمریکا بەتایبـەتیش لـەرووی کۆمەڵایەتییـەوە کاردەکاتە سەر رەوشت‌و هەڵس‌و کەوت‌و کولتوری کۆمەڵگاکانی ترو ئەمەش دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی جۆرێك لە فەوزای کۆمەڵایەتی، چونکە کۆمەڵگەی ئــەمریکی لــە نــاوخۆدا لەبــەر هەرەشــەی لەناوچــووندایە، پەیوەندیــە

[٤٦] محمد مقدادي: امريكا و هيكلة الموت، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥١

کۆمەڵایەتیـــەکان رۆژ بـــەرۆژ لاواز دەبـــنو تـــاك گـــەڕایی بووەتـــە بنـــەمای پەیوەندیەکانو پراگماتیەتو بەرژەوەندی خـوازی بوەتـە فەلـسەفەی ژیـانی ئەمریکیەکان.

رۆجیە گارۆدی دەڵێت: ئێستا ئێمە لە سەردەمی بۆگـەن بـوونی مێـژوودا دەژیـن، کـە کەوتۆتـە ژێـر هـەژموونی تـەکنۆلۆژیاو سـەربازیەکی لەناوبـەری داگیرکەرانە، هەڵگری هیچ پرۆژەیەکی مرۆیی نییـە، کـە لـە توانایـدا هـەبێت مانایەك بـە ژیـانو مێـژوو ببەخـشێت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە گـارۆدی پـشت بـە زانیاریەکانی پۆلیسی ئـەمریکی دەبەسـتێتو دەڵێـت لـە ئـەمریکادا هەرسـێ سەعات جارێك ژنێکی ئەمریکی دەسـت درێـژی دەکرێتـە سـەر، لـە هـەر دوو سەعاتێکدا یەکێك دەکوژرێت، هەر ٣٠ چرکەیەك دەست درێژیەك روودەدات، ئـەمریکا پلـەی یەکـەمی هەیـە لـە خۆکـوژی تازەپێگەیـشتواندا، هـەروەها رێـژەکانی تـاوانیش زۆربـەرزەو لـە ئـەمریکادا ٢٠ ملیـۆن بەکاربـەری مـادە هۆشبەرەکان هەیە، ئەمەیە شێوازی ژیانی ئەمریکی بۆ ئەوانەی کە بـاس لـە پەروەردەی ئەخلاقی دەکەن[٤٧].

دیاردەکـان هـەژاریو نەگبـەتیو دامـاوی کـە لـە شـارەکانی (هـارلم)و (برونکس)و شەقامەکانی (کوینز)و چەندان شاری تری ئەمریکیدا دەبینرێت، ئەو مەشهەدانە هەستی بچوك بوەوەی مرۆڤو بۆگەن کردنی بەها مرۆییـەکان دەخاتە روو، ئەویش: هۆی ناهاوسەنگیو بارودۆخی ترس کە لـەژێر سـایەیدا کەسـانێك لەگـەڵ جـرجو مـشکدا ژیـان بەسـەر دەبـەنو شـەوانیش لەسـەر شـەقامەکانو ناومیترۆکانـدا دەخـەون، ئەمـەش بوەتـە هـۆی ئـەوەی کاردانەوەیەکیان لەلا دروست ببێت بەرامبەر بە ژیـان، چـونکە ژیـانی ئـەوان

---

[٤٧] مجلة المستقبل العربي،ژ ٢٥٧،ل٧٧

تەنها نەبوونی هەژاریو نەگبەتییە، لەم حاڵەتەدا ئـەم جۆرە خەڵکانـە پـەنا دەبەنە بەر خواردنەوەی مەیو خواردنی مادە هۆشبەرەکان بەبێ سنور هەتا مردن، پەنا بردن بۆ جگەرە خواردن هەڵمژینی سیکۆتینو پاشان دەرزی دان لە خوێنبەرەکانیان، لەم ژیانە ناهەموارەدا پەنا دەبەنە بەر هەموو شتێکو بۆ ئەمەش هیچ یاسایەك نایانترسێنێت، دەست دەدەنە دزیو کوشتن بەوپـەڕی ئازایەتیو چاونەترسی[٤٨].

مامەڵـەی ئێستای ئەمریکیـەکان بـۆ گـەلانی تـرو شارسـتانیەتەکانی تـر جیاوازی نییە لە ئەو دیدو تێڕوانینەی کە ئەمریکیەکان هەیانبووە بۆ هندیـە سورەکان، ئەگەر بەو پێوەرو ئەخلاقە جارێکی تر ئەمریکا بخوێنینەوە، ئەوا دەگەینە ئەو راستیەی کە بانگەشەی ئەمریکیەکان بۆ رزگارکردنی جیهان لـە جەوهـەردا راسـتیەك نییـە کـە لـە واقیعـدا هەسـتی پـێ بکرێـت، چـونکە ئەمریکیـــەکان لـــە دەرەوەی ســـنورەکانی خۆیانـــدا بـــە درێـــژایی مێـــژوو نـەیانتوانیوە ببنـە رابـەری دیموکراسـیو مـژدەدەری ئـازادیو چەسـپاندنی مافـەکانی هـاوڵاتی، بەتایبـەتیش لـە جیهـانی ئیـسلامیدا ئەمـە بـە ئاشـکرا دەبینرێـت کـە دوایەمینیـشیان لـە مامەڵـەیان لەگـەڵ ئـەزموونی عێـراقو ئەفغانستاندا بە باشی دەرکەوت، لەکاتێکدا کـە ئـەوان هـەموو دەسـەڵاتێکی ئـەم دوو وڵاتـەیان بەدەسـتەوەگرت، دەیـانتوانی سیـستمی سیاسـیی لـەم وڵاتانـەدا لەسـەر بنـەمای دیموکراسـی دابڕێژنـەوە، بـەڵام ئەمـەیان نـەکردو کاتێکیش کە پاشەکشەیان کرد وڵات بەرەو پشێویو ئاژاوەو گەندەڵیەکی بێ شومار هەنگاوی نا، یەکێك لە ئەخلاقی مێژینەی ئەمریکیەکان ئەوەیە کە ئەو

---

[٤٨] د.محمد مقدادي:العولمة–رقاب كثيرة وسيف واحد،المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، چ١ ٢٠٠٠م، ل٦٢.

وڵاتانـەی تێـی دەچـن نیـوەی دەکـەن بـە گـژ نیوەیـداو شـەڕێکی نـاوخۆ هەڵدەگیرسێت، لەگەڵ هندیە سـورەکاندا ئـەم کارەیـان کـرد، باپیرەی ئـەم ئەمریکیانە چەکیان دابەش کرد لە نێو خێڵەکانی هندیـە سـورەکان‌و هانیـان دان بۆ شەڕی دژ بەیەك‌و بەم هۆیەشەوە هەزاران کەسـیان لەیـەکتر کوشـت، بـەڵام ئەمریکیـە داگیرکـەرەکان تـەنها قەترەیـەك خوێنیـان لێ نـەڕژا، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی کـە هـەزارانی تریـان خـستە ژێـر ئەشـکەنجەو ئـازارو کوشتیان‌و جینۆسایدێکی تەواویان بەسەر ئەو گەلـەو شارسـتنانێتیەکەیاندا هێنا، کوشتارەکانیان ژنان‌و منداڵان‌و گەنجان‌و پیـاوانی گرتبـوەوە، ئـەوەی کـە لـە پاشمـاوەی کوشـتارەکانیان مـابوەوە بـەرەو باکوریـان نـاردن هـەتا زۆربەیان لە سەرمادا رەق بوونەوە.

ئەمە چ مرۆڤ دۆستیەکە کە ئەمریکیەکان بانگەشەی بۆ دەکەن لەکاتێکدا ساڵانە لە ئەمریکادا ٢٠ملیۆن دۆلار خەرج دەکرێت بۆ سـەگـو پـشیلەکانیان، بۆئــەوەی بەخۆشــی بــژین‌و بــە خــەوێکی ئــارام بخــەون، ئایــا ئەگــەر شارستانیەتێك نرخێك بۆ بەهاو کلتوری کۆمەڵگەی خۆی دانەنێت‌و بۆ ژیـانی هاوڵاتیـانی ئـارامی‌و ئاسـایش‌و خۆشـگوزەرانی دابـین نـەکات؟ ئایـا چـۆن دەتوانێت بانگەشـەی خۆشـگوزەرانی بـۆ گـەلان بکـات؟، ئەگـەر ئـەم هێـزە رابەرایەتی ئەم کەشتیە بگرێتە دەست دڵنیا بن بـەرەو چـینەکانی ژێـرەوەی دۆزەخمان دەبات[٤٩]

ئەوەی کە تیورسـینەکان‌و رونـاکبیرو فەیلەسـوفو ئـەکادیمیای ئـەمریکا باسی دەکەن لە کۆتایی مێژوو، یان هەر مژدەیـەکی تـر لـە لیبرالیـزم‌و وێنـە جوانـەکانی بـۆ ئاینـدەی ژیـانی گـەلان، کـە زۆرجـار بـەجۆرێك پـیرۆزی پـێ

---

[٤٩] سەچاوەی پێشوو، ل٦

دەبەخشن کە وەك ئایینێکی نویێو مژدەیەکی خـوایی باسـی دەکـەن، بـەڵام لەگەڵ ئەو ئەدەبیاتە تیۆریەدا کە بۆ جیهانی لیبرالیزم باس دەکرێت، واقیعە سیاسیەکە بەهەمان ئاراستەدا ناڕوات، چونکە ئێمە لە کۆنـداو لـە ئێـستاشدا ئـەو ئەمریکایـەی دەیبیـنین، زلهێزێکـی جیهانیـەو لەسـەر بنـەمای ململانێـی شارســتانیەکان هــەنگاو هەڵــدەگرێتو تــەنها لــە روانگــەی بەرژەوەندیــە سیاسییو ئابوریەکانیەوە مامەڵە لەگـەڵ دەرەوەی خۆیـدا دەکـات، ئەمـەش پرسیاری لەسەر ئەو بانگەشـە مـرۆڤ دۆسـتیە کـردووە کـە ئەمریکیـەکان بـۆ خۆیانی دەکەن، رۆژئاواییەکان بەگشتیو ئەمریکیەکان بەتایبەتی ئەو هێزانە نین کە بە تەنگ ئازادیو سەربەخۆییو دیموکراسیو مافی چارەی خۆنوسیی گەلانەوە بـێن، ئەگـەر ئـەم دیدوبۆچـوونە لەسـەر ئـەزموونی هەڵوێستەکانی رۆژئاوا بە گشتی لە ئاست کێشەی گـەلێکی سـتەم دیـدەی وەك گـەلی کـورد هەڵــسەنگێنین، هەڵوێـستی نامرۆڤانــەی گــەورە بــەدی دەکــەین، چــونکە لەکاتێکدا کە ئەوان بە سیاسەتەکانی خۆیان لەدوای جەنگی جیهـانی یەکـەم کوردستان دابەش دەکەن، لە دوای ئەوەش بە درێژایی دوو سەدەی بیـستو بیستو یەكو ئێستاشی لەگەڵدا بێـت پـشتیوانی لـە دەوڵەتـە داگیرکـەرەکان دەکەنو ئاوڕێك بەلای پێشێلکاریەکانی مافی مرۆڤو مافی چارەی خۆنوسینو ئازادیو مافی هاوڵاتی بوونی کورداندا نادەنەوە، ئەوە سەرەڕای ئـەوەی کـە هەڵوێـستیان لـە ئاسـت خـەباتی رزگـاریخوازی گـەلان لـە ئـەمریکای لاتـینو باشوری ئەفریقیاو رۆژهەڵاتی ناوەراسـت باشـتر نـەبووە لـەو مامەڵەیـەی کـە لەگەڵ کورددا کردویانە.

رۆژنامەی (واشنتۆن پۆست) لە وتارێکدا دەنوسێت (پێویـستیمان بـە نـەوتی سـعودیو بەکارهێنانـەکانی گـرنگترە لـەلامان لـە مافـە مەدەنیـەکانو مـافی

ئـافرەتو شـتی تـر لـەو وڵاتـەدا). هەرچـەند ئێمـە دڵگرانـی خۆمـان دەردەبـڕین بەرامبەر بوونی دیکتاتۆریەت لە جیهاندا، بەڵام ناشمانەوێت لە خۆمـان توڕەیـان بکەین، ئێمە پێویستمان بە کانزای کروم هەیە لـە باشـوری ئـەفریقیا، هەرچـەند لەو وڵاتەدا هێزێکی جوداخوازی رەگەزی قێزەونیش هەیە[٥٠]

ئەگەر بە وردی توێژینەوەی زانستی لەسـەر هەڵوێستی ئـەمریکا بکرێت لـە بەرامبــەر مافــەکانی مــرۆڤو ژینگــەو چــەکە کۆکوژەکــانو زۆر هۆکــاری تــری لەناوبەری مـرۆڤ ئـەوا پرسـیاری زۆر گـەورەی لەسـەر دروسـت دەکرێـت، بـەپێی راپۆرتە زانستیەکان ئـەمریکا زۆرتـرین رێـژەی پـیس بـوون لـە ژینگـەدا بەرهـەم دەهێنێت، ئەم وڵاتە کە ئێستا خۆی بـە رابـەری بـەجیهانیبوون دەزانێـت، بـەڵام لـە بـواری ژینگـەدا زۆرتـرین بەرهـەمی پـیس بـوون هەیـە، لـە ئێـستادا رێـژەی دانیشتوانی ئەمریکا ٤٪ی دانیشتوانی جیهانە، بـەڵام رێـژەی ٢٥٪ی پیـسبوونی ژینگە بەرهەم دەهێنێت. ئەمریکا بەشێك لە پیس بوونی ژینگە رەوانەی وڵاتـانی تر دەکاتو بەمەش مەترسی زۆری بۆسـەر ژیـانی ئـەو گەلانـە دروسـت کـردووە، بەمــەش بـارودۆخی ژیـانی ئـەو گەلانــە زۆر بــەرەو خراپــی رۆیـشتووە، کینیـدی گیرهام (Geerham) باس لەوە دەکات کە ئـەمریکا بـە بەرپرسـیار دەزانرێـت لە دروستبوونی ئـەو غـازەی کـە لـە (ماڵـە شوشـەییەکانی) (Green house) دروست دەبێت، ئەمەش کاریگـەری هەیـە لەسـەر بەرزبوونـەوەی پلـەی گـەرمای زەوی کە ئێستا رێژەکـەی گەیـشتۆتە ١٣–١٨٪ بەمـەش ئـەمریکا بەرپرسـە لـە ٢٠٪ ئەو پیسبوونی ژینگەیەی کە ئێستا لە ئارادایە.

لـە لێـدوانێکی تـردا دەڵێـت، ئـەمریکا هەڵوێـستێکی سـلبی هــەبوو لـە کۆنگرەی باڵای زەوی کـە لـە سـاڵی ١٩٩٢دا بەسـتراو وازۆی لەسـەر بـەیانی

---

[٥٠] محمد مقدادي :امريكا و هيكلة الموت، **سەچاوەی پێشوو**، ل١٥٥.

قەدەغــەکردنی بازرگــانی ئــەتۆمی نــەکرد، [51] هەڵوێــستەکانی ئــەمریکا، هەڵوێستێکی جیهانی مرۆڤ دۆستانە نین کە لەسەر بنەمایەکی گشتی مرۆیـی دامەزرابێت، (ئەمریکیەکان هەڵدەستن بە سەپاندنی یاساو بەیاننامـەکانیان، چونکە ئەوان هەڵگری دروشمی تاك گـەراینو دەیانـەوێت دروشمـەکانیان لـە ڕێگەی هێزەوە بچەسپێنن، و فەیلەسوفی بەناوبانگ (رینیە جیرار) باس لـەم راستیە دەکاتو دەلێت ئەوان لە هەوڵی ئـەوەدان حـەزو ویستەکانی خۆیـان بەسەر ئەوانی تـردا فـەرز بکـەن، ئـەویش بـەهۆی هـەژموونی ئـەوان بەسـەر وێنەوە لە رێگەی میدیاو تەلەفزیۆنەوە [52]

دکتۆر عابد جـابری، جـەخت لەسـەر ئـەم بۆچـوونە دەکاتـەوەو دەڵێـت، "بــەجیهانیبوون تــەنها ئالیــەتێك لــە ئالیەتــەکان گەشــەو پەرەســەندنی سەرمایەداری نییە، بەڵکو جۆرێکە لە ئایدیۆلۆژیاو بە شێوەیەکی راستـەوخۆ تەعبیر لە ئیرادەی هەژموونی خـۆی دەکـات بەسـەر جیهانـداو دەیـەوێت بـە ئەمریکایی بکات لەسەر ئەم بۆچوونەی مامۆسـتایانی بـەناوبانگی ئـەمریکی، (هیـدبرت شـیلر) لـە کتێبـی (هۆکـانی راگەیانـدنو ئیمپراتۆریـەتی ئـەمریکا) پشتیوانی لێ دەکات [53]

هــەژارکردنی وڵاتــانو بــەتاڵانبردنی ســەوەتو ســامانیانو گواســتنەوەی نەخۆشــی بۆیــان، وێرانکردنــی ژیــانی گــەلانو ســڕینەوەی خەســڵەتە مرۆییــەکانیانو کوشــتارو نــەفی کردنــی بــەرگریکاران، ئەمانــە لــە ســیفاتە دیارەکانی ئەوانە، ئەوان هەموو جۆرە هۆکارێکیان بەکار هێنا بۆ لـەناوبردنی

---

[51] محمد مقدادي : دیکتاتوریة العولمة، سەچاوەی پێشوو، ل١١٤

[52] د.سعید اللاوندي:بدائل العولمة، سەچاوەی پێشوو، ل١٨٥

[53] تعقیب/نیل الدجاني:العرب والعولمة، سەچاوەی پێشوو، ل٣٣٧

گەلان، ئەوان دەیانەوێت بە عەقڵیەتی ئاغاوە مامەڵە لەگەڵ گەلاندا بکەن‌و ئەوانیش وەك كۆیلە سەیر بکەن، واشی لە قەڵەم دەدەن کە قەدەری خوایە کە ئەوان ئاغاو سەرکردەن‌و ئەمەش دەگێڕنەوە بۆ بەشێك لە سروشتی گەردوون‌و ئیرادەی خوایی[٥٤].

ئەمریکیەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە هەڵگری ئالآی ئازادی‌و خۆشگوزەرانی‌و دیموکراسیەتن بۆ گەلانی جیهان‌و هەر ئەوانن کە هەڵگری ئیرادەیەکی خێرن بۆ مرۆڤایەتی‌و لەپێناو ئازادی گەلاندا کاربکەن‌و دژی تاکڕەوی‌و عەسکەرتاریەت بوەستنەوە، ئەوان بە شوێن دادپەروەریدا دەگەڕێن‌و دژی ستەمکارین لە جیهاندا، ئەوان لە کۆتاییەکانی سەدەی رابردەوەوە لەپێناو ئازادی گەلان‌و پاراستنی سەربەخۆییاندا، دەستیان داوەتە جەنگی دژ بە تیرۆریزم‌و توندڕەوی‌و بۆ ئەم مەبەستەش بەجۆرێك لە پیرۆزیەوە باسی پەیامەکەیان دەکەن، بەلای بەشێك لە روناکبیران‌و ئەکادیمیەکانەوە ئەمە بەشێکە لە پەیامی پیرۆزی خوا کە لە رێگەی گەلی ئەمریکاوە دەگەن بە گەلانی جیهان، گەلی ئەمریکاش وەك گەلی هەڵبژاردەی خوا پێناسە دەکەن. ئەوان وەك ئیرادەیەکی خێر دژ بە ئیرادەی شەڕ دەوەستنەوەو لەم پێناوەشدا جەنگێکی پیرۆز دەکەن، بەڵام لەکاتێکدا کە ئەم گوتارە تیۆریە دێتە سەر زەمینی واقیع پێچەوانەکەی دەبینرێت، بەتایبەتیش لە ئاست رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. لەکاتێکدا کە سەیری واقیع دەکەین ناراستی ئەو مژدانە دەبینین کە بەڵێنیان پێ دەدان بە جیهانێکی دادپەروەرترو مرۆڤ دۆستانەتر ئەوەی بانگەشەیان بۆ دەکرد لە کۆتایی سەدەی رابردو و سەرەتای ئەم سەدەیەشدا هەمووی سەرابێك بوو، چونکە ئەوەی بینیمان گاڵتە کردن بوو بە چارەنووسی بەشێك لە

---

[٥٤] د.محمد مقرادي:ماالعولمة، سەچاوەی پێشوو، ل٦

گـەلانو دروسـتكردنی ئـاژاوەو نـاكۆكی بـوو لـە نێوانيانـداو گاڵتـەكردن بـوو بـە دوارۆژو قـــەدەری زۆربـــەيان، دەبوايـــە زانـــستو پێـــشكەوتنو داهێنانكاريـــەكان هۆكارێك بوونايە بۆ هێنانـەدی خۆشـگوزەرانیو دابينكردنـی ئـارامیو ئاسـايش، بەڵام بـە پێـچەوانەوە پێـشكەوتنی تـەكنۆلۆژیو شۆڕشـی زانيـاری بارگرانيـەكی تری زياد كرد بۆ گەلە دواكەوتوو ژێردەستەكان، چونكە خـاوەن تـەكنۆلۆژياكان ئەوەيان چەسپاند كە مرۆڤايـەتی بـريتی نييـە لـە زانـست، بـەڵكو زانـست تـەنها روكەشێكە بۆ جيهانێكی درۆو خەياڵی بۆ كۆمەڵێك كەس وە هەربـەم شـێوەيەش دەمێنێتەوە هەتا ئەوكاتەی كۆمەڵێك پياوی روناكبير لە داهـاتوودا چارەنووسـی مرۆڤايەتی دەگرنە دەست. لەم روانگەيەوە دەتـوانين بڵـێين ئەمريكيـەكان لـەناو كايەی بەجيهانيكردندا لە سەر دوو ئاست كاردەكەن:

## ئاستی يەكەم/ بە ئەمريكايی كردنی كولتور

ئەوانەی باس لە بـە ئـەمريكايی كـردن دەكـەن، مەبەسـتيان ئـەو بڵاوبونـەوە بەرفراوانەيـە كـە بەرهەمـە كولتوريـەكانی ئـەمريكا بـەخۆيوە بينيـوە[55]. ئـەو شێوازە كولتوريەی كە سياسەتی ئەمريكا دەيانەوێت بەجيهانی بكـەن، جۆرێكـە لە كولتور، بەپێی ئەمە جيهان دابەش دەبێت بۆ كۆمەڵێگ گروپی كولتوری، كـە رێگە دەدات بە وەرگرتنی كولتوری ئەمريكا لە هەرشوێنێكدا كە بيـەوێت، وە بـە شـێوازێكيش بێـت كـە ئـەو دەيـەوێت، كولتـوری ئـەمريكی دەيـەوێت هـەژموونی خۆی بسەپێنێت بەسەر هەموو ئەو گەلانەدا. (برنار كاسـين) دەڵێـت ئـەوەی كـە دەيـەوێت بگاتــە كولتــوری بــاو، پێويــستە لــە كولتورێكــدا بتوێتــەوە كــە نــە گەردوونيەو نە ئەنگلۆ ساكسۆنيە بەڵكو ئەمريكيە[56]

---

[55] د.برهان غليون،سمير امين:ثقافة العولمة وعولمة الثقافة، سەچاوەی پێشوو، ل٤٧

[56] يحى اليحياوي:العولمة،أيه عولمة؟ سەچاوەی پێشوو، ل١٩.

د. محمد مقدادی رایەکی تری هەیە بەرامبەر بە کولتـوری بـە ئـەمریکایی بوونو دەڵێت (سیاسەتی ئەمریکا خەیاڵی زاڵکردنـی هـەژموونی خـۆی هەیـە بەسـەر جیهانـدا، زۆر بەجـدیو لـە ڕێگـەی هێـزەوە کـار دەکـات لـەپێناو لەناوبردنی ئەو تایبەتمەندیانەی کە کۆمەڵگەکان لە ئەم بونەوەرەدا هەیانـە، چونکە ئامانجی سەرەکی ئەو بریتیـە لـە بـەجیهانی کردنـی شـێوازی ژیـانی ئـەمریکی، بۆئـەوەی وای لێ بێـت کـە هـەموو دانیـشتوانی سـەرگۆی زەوی بخەویێو خەوببینیێو هەڵسێو هـەموو جـۆرە خراپەیـەك بكـاتو بـاوەش بـە دنیاو جوانیەکانیدا بكاتو هـەموو جـۆرە کوشـتارێك ئـەنجام بـداتو دەسـت بكـات بـە خـوێن مـژینی گـەلانو هاوڵاتیـان بـە شـێوازی ئـەمریکی، لێـرەدا هۆکارەکان دەخرێنە خزمـەت ئامانجـەکان)[٥٧]. بـە بـڕوای ئەمریکیـەکان بـە کولتوری گەلانی ترئەوەیە کە توانای ئەوەیان نییە کە ببنە کولتوری جیهانی و بۆ ئەم مەبەستەش سـەدان ڕەخنـەی تونـد لـە کولتورەکـانی تـر دەگـرنو تاوانباریشی دەکەن بە جۆرەها ناتەواوی.

زۆربەی توێژەرانی ئـەمریکی لەسـەر ئـەوە کـۆکن کـە لـە ئێـستا بـە جیهـانی بـوونی کولتـور تـەنها بریتییـە لـە بەگـشتی کردنـی کولتـوری ئـەمریکا بەسـەر جیهاندا، هەندێك لە نووسـەرە ئەمریکیـەکان دەیانـەوێت ئـەوە بڵـێن کـە بـەهۆی بوونی کۆمەڵێك خاڵی سلبیەوەیە کە بارودۆخ ڕەخساوە بـۆ هـەژموونی کولتـوری ئـەمریکی بەسـەر کولتورەکـانی تـردا، یـەکێك لـە گـرنگترین خاڵـە سـلبیەکانیش ئەوەیە ئەو کولتورانە کولتوری نوخبـەن، کولتـوری دروسـتکردنی کـۆتو بەنـدن بۆ مرۆڤ، ئەم کولتورانە بریتین لە جۆرێك لـە بۆچـوونی ئـایینی، ئـەم کولتورانـە زمانێك بەکار دەهێنن کە بێجگە لە نوخبەیەکی کـەم لـە پیـاوە ئاینییـەکان تێـی

[٥٧] د.محمد مقدادي:ما العولمة؟،مصدر سابق،ل١٣٧

ناگەن، ئەمەش لە ئێستادا خواستەكانی مرۆڤی هاوچەرخ ناهێنێتەدی، لەبەرئەوە بۆ ئەو مەبەستە دەگەڕێن بەشوێن كولتورە هاوردەكان، یان ئەو كولتورانەی كە كۆمەڵگە داگیر دەكەن[٥٨].

لەسەر جەخت كردنەوە لەسەر هەمان بۆچوون م. رزوندروف دەڵێت: "پێمان خۆش بێت یان ناخۆش بێت، ئەمریكا ئەو لایەنەیە كە لە ئێستادا پلانی ژێرخانی كۆمەڵایەتیو كولتوری جیهان دادەڕێژێت، چونكە ئەمریكا بە توانایەو زۆر بە ئاسانی دەتوانێت بگاتە هۆكانی بەرهەمو بڵاوكردنەوەی فیكرەكانو شێوازی ژیان لە سەرتاسەری جیهاندا، لەلایەكی ترەوە ئەمریكا خاوەنی كۆمەڵێك تایبەتمەندی كولتوریو مێژووییەو ئەمەش زیاتر هاوكاری دەكات بۆ بڵاوبوونەوە"[٥٩] ئەو دیدو بۆچوونانەی كە باسمان كرد دەیانەوێت ئەوەمان پێ بڵێن كە كولتورە نارۆژئاواییەكان كولتوری میللیو كاریگەریان سنوورداروداخراونو هیچ سیفەتێكی جیهانیان تێدا نییە هەتا بەشداری داڕشتنی كولتوری جیهانی بكەن.

روزندروف جەخت لەسەر ئەو بۆچوونە دەكاتەوەو دەڵێت: "وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە سەدەی بیستو یەكدا وەك تاكە جەمسەری باڵا دەست دەمێنێتەوە لە بواری كولتوری جیهانیدا، هەروەك چۆن لە سەدەی بیستیشدا هەر بەهەمان شێوەبوو، من لەو بڕوایەدام زیاتریش بێت، بەپێی ئەو پێشینە مێژووییەی كە هەیەتی، ئەمریكا زۆر بە ئاسانی دەتوانێت دەست بگرێت بەسەر هەر هۆكارێكی پەیوەندی جەماوەری نوێ كە دابهێنرێتو دروست بكرێت، لەو بڕوایەدام كە ئەمریكا كۆنترۆڵی هیچ

---

[٥٨] العولمة والخيارات المستقلة،مجلة المستقبل العربي،ل١٩،نقلا عن jeremy tanstallKthe medıa(amerıcan new york:Colombia university press 1977)

[٥٩] نيل م .روزندورف :العولمة الاجتماعية والثقافية، سەچاوەی پێشوو، ل١٦٣

ناوچــەیەك لەدەســت نــادات کــە ئێــستا لەژێردەســتیدایە، ئــەم دەســت بەســەراگرتنەش دژی پاشەکــشەو کارەســاتە دبلۆماســیەکانو رووداوەکانــە، ئەمەشی بۆ دەکرێـت، چـونکە ئـەمریکا سـیادەی خـۆی سـەپاندووە بەسـەر تــەکنۆلۆژیای خۆشـیەکان و بەرنامـە جۆربـەجۆرەکانی دا. ئەمـەش هـەر لـە سەدەی بیستەوە کردوویەتی بۆ ئەم مەبەستەش توانای جۆراوجۆری هەیـەو بە مێشکێکی بەهێزی ترسناکەوە مامەڵە دەکات لەم بوارەداو لـەو بڕوایـەدام کە لە ئایندەشدا هێزێکی تازە نییە جێگەی بگرێتەوەو ناشبێت"[٦٠]

شێوازەکانی ئەمریکا بۆ پەیداکردنی هەژموونی خۆی لە بواری کولتوریـدا بــەزۆری دەگەڕێتــەوە بــۆ ئــەوەی کــە لــە رۆژگــاری ئــەمڕۆدا، ســەنتەری تەکنۆلۆژیاو گەشـەی فیکـریو فەلـسەفیو مـەعریفی لـە رێگـەی ئـەکادیمیاو روناکبیرەکانی رۆژئاواوەیە، وە لەبەرئـەوەش کـە لـە نێـوان دەسـەڵاتو ئـەو سـەنتەرە جۆربەجۆرانـەدا هەماهـەنگیو پێکـەوە گونجانێـك هەیـە، لەلایـەك دەتوانن بـۆ ناوخۆیـان کولتـورێکی گەشـەکردو بنیـات بنـێن، بـۆ دەرەوەش دەزانن بە چ گوتارێك کولتورەکانی ترداگیر دەکەن.

لەدوای جـەنگی ساردەوە ئـەمریکا دەسـتی گرتـووە بەسـەر سەرچـاوەکانی زانیاریداو لەم بوارەشدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، چونکە ئـەم بـوارەی وەك سەنتەرێکی هێـز لێکداوەتـەوە بـۆ ململانێکـانی ئاینـدەو هـەر لـەم رێگەیەشـەوە دەیەوێت باڵادەستی خۆی بۆ کۆنترۆڵکردنی جیهان مسۆگەر بکات.

دوای ئەوەی ئەمریکا لە سەدەی رابـردوودا تـوانی دەست بەسـەر چـەکە تەقلیـدیو ئەتۆمیەکانـدا بگرێـتو بـەم هۆکارەشـەوە لــە جـەنگی ساردا ســەرکەوتنی بەدەســت هێنــا، ئێــستا روی کردۆتــە دەســت بەســەراگرتنی

[٦٠] سەچاوەی پێشوو، ل١٧٢

جۆرێکی تر لە چەك کە چەکی زانیاریو کولتوروو راگەیاندنە (راگەیاندن دراوێکی نوێیە لە مەملەکەتی جیهانیدا، ئەمریکا لە ئێستادا لەهەر ولاتێکی تر بەتواناترە بۆ کەڵك وەرگرتن لە توانا ماددیو ئەلیکترۆنیەکان لە رێگەی راگەیاندنەوە)[61]

ئەمریکا لە بواری سینەماو هونەردا ئێستا رۆڵێکی کاریگەرو جیهانی هەیەو توانیویەتی بەشی زۆری ئەم بوارە لەسەر ئاستی جیهاندا کۆنترۆڵ بکات، ئەمە نەك تەنها لەسەر ئاستی رۆژهەلات و باشور، بەڵکو ئەوروپاشی گرتۆتەوەو لە بەرامبەر ئەمەشدا روناکبیرانو سیاسیەکانی ئەوروپا هەستیان بەم مەترسیە کردووە. (ویلیام هیس) کە یەکەم سەرۆکی دەستەی دەرهێنەرو بەرهەمهێنەرانی سینەمای ئەمریکایە دەڵێت "پێویستە ئەمریکا سەرپەرشتی بواری سینەماو بەرهەمە خۆشەکان بکات لەسەر ئاستی جیهان، لە بۆچوونێکی تریدا دەڵێت بەڕاستی ئەمریکا دەوڵەتی جیهانیە، چونکە لە ئەمریکادا هەموو رەگەزو بیروباوەڕو پیاوێك هەیە"[62]

ئەمریکیەکان هۆکاری سەرکەوتنی ئەم کولتورە دەگێڕنەوە بۆ ژێرخانێکی بەهێز، کە جیاوازە لە کولتورەکانی تر واتە هەڵگری کۆمەڵێك رەگەزە کە لە کولتورەکانی تردا نییە بەپێی وتەی (فول بامبیر) کولتوری ئەمریکایی بریتییە لە کێبرکێ لەنێوان ئاسانو گران، خێراو هێواش، ئالۆزو سادە، هەر یەکێك لەمانە پەیوەستە بە بەرهەمێکی کولتوری کە دەبێتە مایەی سەرنج راکێشانو هەستکردن بە مەزنی، بەڵام دووەمەکەیان تەعبیرە لە گاڵتەجاڕیو هیلاکیو لەش داهێزان، دزنیو ماکدۆناڵد، رەواج دانە بە ئاسانیو خێراییو

---

[61] د.السید ولد اباه:إتجاهات العولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل١١

[62] نیل م .روزندورف :العولمة الاجتماعية ..... سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٤

سادەیی[٦٣]. لە بەشێکی تر لە سیفەتە باشەکانی کولتوری ئـەمریکی دا بـەم شێوەیە باسی دەکەن:

کولتوری میللـی ئـەمریکی جۆراوجـۆرە، سێکسیو توندوتیـژو ئەفسانەو مـاددیو ڕۆمانـسیە، لـەروی خۆشـی یـان بـازاڕی شمـەکی بەکاربردنـەوە بەشێوەیەکی گشتی هیوابەخشو خۆش مامەڵەو دیموکراتیە[٦٤]

کولتوری میللی ئەمریکی، بڵاوبوونەوەیـەکی بەرچـاوی بـەخۆوە بینیـوە، بەشێوەیەك کە لە ئێستادا توانیویەتی کۆنترۆڵی زۆربـەی حـەزو ویـستەکانی دانیشتوانی جیهان بکات، بەسەر زۆربـەی کولتورەکـانی جیهانـدا زاڵ بـووە، بەتایبەتی لەبواری میوزیكو سـینەماو تەلەفزیۆنـدا، ئـەم بـوارە کولتوریـەش هاوتەریبە لەگـەڵ بڵاوبوونـەوەی سـتایلی ئـەمریکی لـە بـواری جـلو بـەرگو شمەکی بـەکاربردن، ئەمـەش کاریگەریـەکی زۆری لەسـەر چـینو توێـژەکانی کۆمەڵگە دروست کردووە بەتایبەتی گەنجان، هەروەها لە بـواری زمانیـشەوە توانیویەتی زمـانی ئینگلیـزی لـە ئاسـتێکی جیهانـدا بکاتـە جێگـەی گرنگـی پێدان، لەبەرئەوە ئەگەر سەیر بکەین ئێستا زمـانی ئینگلیـزی بوەتـە زمـانی زانستو کولتورو تەکنۆلۆژیا.

ئەگەر لە بواری زماندا سەرنج بدەین، گەلـە ڕۆژئاواییـەکانیش گرنگیـەکی زۆر بە زمانی E دەدەن و لە هەنـدێك وڵاتـدا ئێـستا گرنگـی لـە زمـانی دایـك زیاترەو بوەتە زمانی فەرمی خوێندنو لە ئاستی دەوڵەتیشدا بەهەمان شێوە بەکار دێت. زمانی E لەلای هەندێك نەتـەوە بـەجۆرێك گەشـەی کـردووە کـە زمانی دایکی خستۆتە بەر مەترسی لەناوچوونو توانـەوە، هـەر لەبەرئەوەیـە

---

[٦٣] هانس-بيتر مارتين و هارالد شومان:فخ العولمة، **سەرچاوەی پێشوو**، ل٤٦

[٦٤] نيل م روزندورف:العولمة الاجتماعية ... **سەرچاوەی پێشوو**، ل١٨٠

که بەپێی توێژینەوەیەکی زانستی لە ٥٠ ساڵی داهاتوودا دەیان زمان لەناو دەچنو زمانی ئینگلیزی جێگەیان دەگرێتەوە، ئەمریکا توانیویەتی بەهۆی ئەو توانایەی کە هەیەتی کۆنترۆڵی جوڵەی هاتوچۆی گەردوونی بکات بەتایبەتیش لە بواری زانیاریو فیکردا، مۆسیقای ئەمریکیو ئەفلامی ئەمریکیو بەرنامە تەلەفزیۆنەکانو بەرنامە کۆمپیوتەریەکان، لە ئێستا کۆنترۆڵی جیهانیان کردووەو زۆر رەواجیان هەیەو بینەرێکی زۆریشیان هەیە، دەتوانین بڵێین ئەمانەی باسمان کرد لە هەموو شوێنێکی جیهاندا هەیەو بە فیعلی کاری کردۆتە سەر ترادسیۆنو حەزو خۆشیو ژیانو تێڕوانینەکانی هەموو نەتەوەکان(٦٥)

ئەمریکیەکان لەکاتێکدا کە وەسفی کولتورەکەیان دەکەن دەیانەوێت ئەوە لە جیهان بگەیەنن کە کولتورەکەی ئەوان کولتوری کۆتایی مێژووەو هیچ کولتورێکی تر ناتوانێت کێبڕکێیان بکات، چونکە ئەوان نموونەی بالان لە ترادسیۆنو فیکرو زانستو تەکنۆلۆژیادا، لەبەرئەوە هەر ئەوانن کە شایەنی بەدەستەوەگرتنی دەسەلاتی بالان لە ئاستی جیهاندا.

نیل.م. روزندروف دەڵێت ئەمریکیەکان توانای داهێنانی کولتورێکی جیهانیان هەیە، چونکە ئەوان زیرەکترینو شارەزاترین خەڵکن بە ناسینی ژیانی مرۆڤایەتی، ئەوان تەنها نوێنەری گەلانی جیهانن، ئەوان دوایەمین پیاوی دنیان!! ئەوان کاتێك باسی کولتوری ئەمریکی دەکەن دەڵێن (لەم کولتورەدا هاولاتیانێکی سەرنج راکێش و بەتواناو سەرکەوتوو پۆشتە دەبینی، ئەوان بە توانان لە قسەکردنو خەیاڵی ئازادو رۆمانسی، ئازادن لە

---

(٦٥) د.سليمان ابراهيم العسكري :اعلام العولمة، **سەرچاوەی پێشوو**، ل٥٥

تەعبیر کردن لەوەی کە لە مێشکیاندا هەیەو ئەوان بە توانان لە هێنانەدی خەونەکانیاندا)[٦٦]

بەلاّم ئەگەر سەیری هۆکارەکانی بەجیهانیبوون بکەین لەروی کولتوریەوەو بمانەوێت لەروی ئەخلاقو بەها مرۆییەکانو سلوکە بەرزەکانەوە شیکاری بکەین، ئەوا دەگەینە ئەو راستیەی کە ئەمریکیەکان نە شارستانیەتو نە کولتورێکی رەسەنیان نییە، تەنانەت ئەوان خاوەنی نیشتمانێکی راستەقینەش نین، ئەو نیشتمانەی کە ئێستا پێی دەلێن ئەمریکا نیشتمانێکی داگیرکراوەو دانیشتوانە رەسەنەکەی جینۆساید کراوەو لەناوبراوەو دەستی بەسەردا گیراوە، کولتوری رەسەنی ئەم نیشتمانە لەناوبراوە، ئەو کولتورەی کە ئێستا پێی دەوترێت کولتوری ئەمریکی، لە راستیدا کولتورێکی ئیمپریالی داگیرکەرە، ئەم ئەخلاقە داگیرکاریە لە شێوازی مامەلەکردنیاندا لە کولتورەکانی تریش دیارە، ئەم کولتورە قولاییەکی مێژوویی شارستانی نییە، ئەو کولتورە ئەمریکیەی کە رۆشنبیران وەسفی دەکەن بە ئاسانکاریو میللیو رەسەن لە مۆسیقاو گۆرانیو سینەماو دەلێت لە ئێستا زۆرترین کاریگەری لەسەر جیهان هەیە، بەلاّم لە داهاتوودا دەبینین کە جیهان بەرەو رووی چ کارەساتێك دەکاتەوە، چونکە کارکردنە لەسەر ژێرخانی کۆمەلاّیەتی کولتورەکانی تر.

لەهەمانکاتدا رەگەزە گرنگەکانی کولتور تووشی هەرەسو دابران دەکاتو کولتور دەکاتە بەشێك لە کالاّکانی بازاڕو کڕینو فرۆشتنی پێوە دەکرێتو هونەرمەندانیش جێگەی بازرگانەکان دەگرنەوەو دەگەڕێن بەشوێن خستنەڕووی هونەرێکدا کە زۆرترین بازاڕی هەبێت، کە ئەمەش هەمووی

---

[٦٦] نیل م. روزندورف العولمة الاجتماعیة والثقافیة، **سەچاوەی پێشوو**، ل١٨٠

لەسـەر بـەهاو ئـەخلاقی ئـەو کولتورانـە دەبێـت، کـە ئەمـەش پێـچەوانەی جەوهەری کولتورەو لادانە لە مانا راستەقینەکەی خۆی.

تەنانەت بەشێکی زۆر لە روناکبیرانی ئـەمریکی هەیـە کـە دودڵـی خۆیـان ناشارنەوە لەئایندەی کولتور لە ئەمریکادا، تەنانەت لە سەرتاسەری جیهاندا، یەکێك لەو کەسانەی کە زۆر تووشی دودڵیو ئیحراجی بـووە، سەرنووسـەری رۆشنبیری گۆڤاری (نیویۆرك تایمز)، کە وەسفی کولتـوری ئـەمریکی دەکـات بە (زبڵخانەی کولتورەکانو کولتوری زبڵخانەکان) ناوی دەبات [٦٧].

ئەوەی کە لە ئێستادا باس دەکرێت لە بڵاوبوونەوەی بـەربڵاوی کولتـوری ئـەمریکی، لـە راسـتیدا ناگەڕێتـەوە بـۆ مرۆیـی بـوونو گـەورەییو گرنگـی بەهاکان، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو فەزا ئابوری سیاسیەی کە ئێستا لەسەر ئاسـتی جیهـان دروسـت بـووەو بەشـێوەیەکی گـشتیش لەلایـەن ئـەمریکاوە ئاراستە دەکرێت.

هەندێك لە روناکبیران لەو بڕوایەدان کە بڵاوبوونەوەی بەربڵاوی کولتـوری ئەمریکی لەسەر ئاستێکی فراوانی جیهانی دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار:

١- باڵادەستی ئابوری ئەمریکی بە سیفەتی ئەوەی کە بازاڕێکی هاوردەو هەناردەیە، هەروەها پشت بەستنی ئابوریـەکانی تـر بەسـەر بەکاربردنـدا لـە ئەمریکا، پاشان هەژموونی کۆمپانیاکانی راگەیاندنی ئەمریکا بەسـەر بـازاڕی جیهانیدا هەموو ئەمانەش بوونە هـۆی ئـەوەی کـە شـێوازی رێکـلامو بـازاڕی ئەمریکی شێوەیەکی بەردەوامی وەربگرێت لەسەر ئاستێکی جیهانی.

٢- ئەمریکا سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەستهێناوە بەسەر کێبڕکێکەرە ئابوریەکانی لە بوارەکانی کولتوری میللی دا، بەتایبەتیش لە بواری پیشەسازی ئەفلامو میوزیکدا[٦٨].

لە راستیدا کولتوری ئەمریکی تەعبیر ناکات لە کولتورێکی رەسەن کە لەگەڵ گرفتو نەهامەتیەکانی مرۆڤدا بژیو بەهاکانی دادپەوەریو چارەسەری گرفتەکانی مرۆڤ بەلایەوە شتێك بێت، کولتوری ئەمریکی رەنگدانەوەی کۆمەڵگەی ئەمریکییە کە کۆمەڵگەیەکی تەکنۆلۆژیە، تیایدا مرۆڤ بەدەست کۆمەڵێك گرفتی دەرونیەوە دەناڵێنێت، مرۆڤێکی پراگماتیە کە تەنها بەشوێن بەرژەوەندیەکانی خۆیدا دەگەڕێت، دەیەوێت لە ئەم فەزایەدا بەشوێن دڵخۆشکردنی تاکدا بگەڕێت بۆ ساتێك هیلاکیو فشارە دەرونیەکانی لەسەر سوك بکات، کولتوری ئەمریکی کولتورێکی بازاڕیە، کار لەسەر شتە رواڵەتیەکانو غەریزەکانی مرۆڤ دەکات، دەیەوێت حەزەکانی بۆ بهێنێتەدی، دەیەوێت لە مرۆڤدا هەڵچوونێکی کاتی دروست بکاتو سۆزی بجولێت، هەموو شێوازەکانی فیلمەکانو میوزیکو گۆرانی.. تەنها بۆ خۆشیو پێکەنینو کات بەسەربردنە، دەیەوێت کاتە بەتاڵەکان پڕ بکاتەوەو هەستەکان بجولێنێت، بەڵام بۆ چارەسەری گرفتەکانو بەدەستهێنانی مافەکان بەشێوەیەکی قوڵ رۆناچێتو نایەوێت بکەوێتە شوێن کێشە مرۆییە قوڵەکان، واتە دەتوانین بڵێین لەم کولتورەدا پەنا نابرێت بۆ چارەسەری عەقڵانی بۆ کێشەکان، بەڵکو تەنها پشت بە سۆزو هەڵچوونو غەریزەکان دەبەستێت.

---

[٦٨] بول سالم :الولايات المتحدة والعولمة، بحث في ندوة (العرب والعولمة )، **سەرچاوەی پێشوو**، ل٢٢٠.
٢٢٠

ئەمریکیــەکان هەســتیان بــەوە کــردووە کــە بــازاڕی کولتــورە بــەرزوباڵاکان سـنورداره، لەبەرئـەوە پـەنایان بـرد بـۆ بـرەودان بـە کولتـورێکی تـر کـە زۆرتـر توانای بڵاوبوونەوەی هەیە، بۆ ئەم مەبەستە ئەوان پـەنایان بـردە بـەر هۆلیـودو کۆمەڵێك ئاژانسی جۆربەجۆر بۆئەوەی بـە ئـەم گرنگیـە هەڵبـستن، هەرچـەند لـە ئەمریکادا رۆماننوسو شاعیرو فەیلەسوفو دەرهێنەرو سینەمایی گـەورە هـەن. دەبینیت کـە رامبـۆو شـواز زیغـزو مـایکڵ جاکسون پێگەیـەکی ئـابوری باشـیان هەیە، هەروەها نوخبەیەك لە روناکبیری گەورەو باش هەنو لەلایـەن دەوڵەتـەوە هاوکاری باشیان دەکرێت، بەڵام ئەمانە نوخبەیەکی دیاریکراون، ئەمانە تەنها لـە بازنەی فیکردا کاردەکەن وە ئەوانیش ئـەوە دەزانـن کـە کولتـوری نـزمو سـادەو ســاکار بــازاڕێکی زۆر باشــتری هەیــە لــە کولتــورێکی بــەرزباڵا[٦٩]. بــەهۆی تەکنۆلۆژیایەکی پێشکەوتوو بە دامەزراوەیی بوونی کولتـورەوە، توانیویـەتی لـە بواری هونەرو سینەمادا پێشکەوتنی بەرچاو بـەخۆوەببینێت، هـەر ئەمەشـە کـە بوەتە هـۆی بڵاوبوونـەوەی کولتـوری ئـەمریکی بەشـێوەیەکی بـەرفراوان لەسـەر ئاستی جیهان.

لە ئێستادا سینەمای ئەمریکی توانیویەتی کۆنترۆڵی بازاڕ بکـات، هۆلیـود لە ساڵەکانی هەشتادا توانیبوی کۆنترۆڵی ٣٠٪ی بازاڕی جیهان بکـات، بـەڵام ئەم رێژەیە لـە ئێـستادا بەرزبۆتـەوە بـۆ ٥٠٪ چـونکە فیلمـەکانی توانیویانـە بەڕێژەی ٨٥٪ لە هۆڵەکانی جیهاندا نمایش بکات، بۆ نموونە فیلمی تایتانیك لـە دەرەوە ١٤٠ هـەزار دۆلاری تێـچووە، بـەڵام لـەناو ئەمریکاشـدا ٢٥ هـەزار

---

[٦٩] **گۆڤاری** مستقبل العربي،سنة ٢٠ مارس ١٩٩٨،ژ ٢٢٩،ل٨٧

دۆلار، ئەمەش جێگەی پرسیارو سەرسوڕمان نیە چونکە ئەمریکا لە ئێستادا هێزێکی جیهانیەو یەکەمین دەسەڵاتدارە لە بواری تەکنۆلۆژیاو پەیوەندیدا[٧٠]

لە ئێستادا بەرهەمی ناردەی ئەمریکی لـە بـواری کولتـوردا دووەمینـە لـە دوای پیشەسازی فڕۆکە، لەساڵی ١٩٩٢ دا ئەمریکا بـایی ٣,٧ ملیـار دۆلاری فیلم ناردۆتە بازاڕەکانی ئەوروپا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو فیلمانەی کە ئەوروپا بەرهەمیان دەهێنێت لە ئەمریکا زۆرترە، لە ئـەوروپادا نزیکـەی ١,٨ ملیۆن کەس لە بواری راگەیاندنو تەرفیهدا کاردەکەنو ئەم ژمارەیە لە ساڵی ٢٠٠٥ دا گەیشتۆتە ٤ ملیۆن کەس، ئەوروپا لە ئێستادا سوورە کە بەرەو روی هەرەشەی ئابوریو کولتوریەکانی ئەمریکا ببێتـەوە لـە بـواری پیـشەسازیو تەرفیهو زانیاریەکاندا[٧١].

لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ئەفلامی ئەمریکی دەستی گرتـووە بەسـەر زۆرینـەی شاشەکانی تەلەفزیۆن لەسەر ئاستێکی جیهانی، تەنانەت جێگەی بە ئەفلامە نیشتمانیەکانیش لێژ کردووەو فیلمە ئەمریکیەکان بەکار دەهێـنن وەك چـۆن کەرەستەو بەرهەمەکانی تری وەك کاوبۆو کوکاکولا بەکار دەهێننو مارلبورو دەکێـشن، لەبەرئـەوە لـە ئێـستادا مەترسـیەکی زۆری ئـەوروپا هەیـە لـە هەژموونی کولتوری ئەمریکی، زۆربەی نوسراوە فەرەنـسیەکان بـە نیگـەرانی باسی هەڵکشانی کولتوری ئەمریکی دەکەن بەسەر کولتورەکانی تردا لەسـەر ئاستێکی جیهانی، لەبەرئەوە ئەگەر سەرنج بـدەین ژیـانی رۆژانـەی تاکـەکان ئەوەنـدەی ئەمریکیـە ئەوەنـدە ئـەوروپی نییـە، کاسـێتە سـینەماییەکانی

---

(٧٠) المنجي الزيدي: الثقافة و المال .. **سەچاوەی پێشوو**، ل١٩

(٧١) د.محمد شوفان:(عولمة الأعلام ومستقبل نظام الأعلام العربي)،مجلة عالم الفكر،المجلد الثامن و العشرون، ع/٢،اكتبر، /ديسمبر ١٩٩٩،المجلس الوطني للثقافة و الفنون والآداب، كويت، ل١٦٧

ئەمریکا توانیویەتی کۆنترۆڵی حەزی ئەوروپیەکان بکات. لە راپرسیەکدا کە لە ئەلمانیا ئەنجام دراوە لە ٩٠٪یان سینەمای ئەمریکیان پێ باشترەو لە ٨٧٪ی بەلجیکیەکانو ٨٣٪ی ئیتالیەکان هەمان هەلۆێستیان هەیە، نموونە ئەمریکیەکان وەك ستیفان سیلبوغو مادۆنا بوەتە بەشێك لە خەونەکانی مرۆڤ لە هەرشوێنێك بن[٧٢] لەسەر ئاستی ئەوروپادا هاوارە مەترسیدارەکانی سەرۆکی فەرەنسی (شیراك) دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو کە داوای لە هەرێمە شارستانیەکان کرد کە یەك بگرنو بچنە پاڵ یەك لە پێناو رێگرتن لە هەژموونی کولتوری ئەمریکاو زمانی ئینگلیزی، ئەویش لە رێگەی بەیاسایی کردنی بەکارهێنانی تۆڕی پەیوەندیو زانیاریەکان[٧٣].

لەکاتێکدا کە ئەوروپیەکان بە ئەو هەموو توانا ئابوریو تەکنۆلۆژیو زانیاریەی کە هەیانە بەئەو شێوەیە بە مەترسی باس لە کولتوری ئەمریکی بکەن بۆسەر شوناسو کولتوری نەتەوەییو نیشتمانیان، کەواتە ئەم کاریگەرییە لەسەر ولاَتانی باشورو لەوانەش ولاَتە ئیسلامیەکان زۆر زۆرترە، چونکە ئەم ولاَتانە هیچ هۆکارێکی روبەڕوبوونەوەیان نییەو لەرووی تەکنۆلۆژیەوە لە ئاستێکی نزمدانو پەروەردەو فێرکردن لە قەیراندایەو سیستمی سیاسیان دواکەوتووەو ئاستی گەشەپێدانیش لە پلەیەکدا نییە کە ببێتە مایەی بەهێزکردنی ئینتمای تاکەکانی بە نەتەوەو نیشتمانەوە.

هەتا ئێستاش زۆرینەی ولاَتانی ناوچەکە پاشکۆی سیاسەتەکانی رۆژئاوان، یان ئەگەر لەگەڵ رۆژئاواش نەبن خاوەنی پرۆژەیەکی گەشەپێدانی

---

[٧٢] د.قيس جواد العزاوي:العرب والغرب على مشارف القرن الحادي والعشرين،مركز الدراسات العربي- الأوروبي بحوث استراتجية (٥)ط١ ، ١٩٩٧، ل٣٤

[٧٣] د.السيد ولداباه:إتجاهات العولمة، **سەچاوەی پێشوو**، ل١٣

**هەمەلایەنەو بەرفراوان نین‌و لە ئاستێکی نزمدا سیاسەت دەکەن کە زۆرتر شێوازی تاکڕەوی‌و تائیفی‌و عەسکەرتاری لەخۆ دەگرێت. بە درێژایی دەیان ساڵ رژێمەکانی ئەم ناوچەیە پاشکۆی رۆژئاوا بوون‌و خاوەنی هیچ ئیرادەیەکی سەربەخۆبوون نەبوون لەبەرئەوە بە درێژایی دەسەڵاتی ئەم رژێمانە جۆرێك لە کولتور بەرهەم هاتووە، کە هەمووی لە پەراوێزی کولتوری ئەمریکی‌و ئەوروپیدا بووە، لەناو ئەم وڵاتانەدا کۆمەڵێك لە رۆشنبیرو میدیاکارو رۆژنامەنووس‌و ئەکتەر دروست بوون کە هەمووی لەسەر کولتورێکی رۆژئاوایی پەروەردەبوون‌و دژ بە کولتوری شوناسی تایبەتی خۆیان کاریان کردووە، لەبەرئەوە لە کەناڵەکانی راگەیاندن‌و تەنانەت پەروەردەو فێرکردنیشدا لەسەر ئەم پرۆگرامە رۆیشتوون‌و بە بەردەوامی لەبەرەوروبوونەوەی ئاین‌و شارستانیەت‌و شوناسی خۆیاندا کاریان کردووە، لەبەرئەوە دەتوانین ئەمانە ناوبنێین رۆژهەڵات ناسە نوێیەکان کە بەردەوام لەژێر کاریگەربوون بە کولتوری ئەوروپی‌و ئەمریکی کاریان کردووە لەسەر رەخنەگرتن لەو بوارانەدا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ماکینەیەکی زەبەلاحی گەورەی رۆژئاوا لە بواری راگەیاندندا کاری کردووە لەسەرکولتورەکانی تر لە رووی:**

**١- گومان دروستکردن لە راستگۆیی دامەزراوەی راگەیاندن.**

**٢- تاوانبارکردن بە سلبیەت‌و ناڕاستی‌و لاوازی‌و بێ متمانەیی.**

**٣- هەڵچوون‌و نازانستی‌و ناڕاستی لە رووی زانیاریەوە[٧٣].**

---

[٧٣] عبدالستارجواد:منطلقات الأعلام الغربي،بحث في ندوة (اشكالية العلاقة اليثقافية مع الغرب ) **سەچاوەی پێشوو**، ل٢٥٠

## دووەم: بە ئەمریکایی بوون و بەکاڵاکردنی کولتور

جیهانی سەرمایەداری، فەزایەکە بۆ کۆنترۆڵکردن‌و دەستبەسەردا گرتن‌و قازانج، بۆ ئەو مەبەستەش هەموو ڕێگەو هۆکارێك دەگرێتەبەرو لە ئێستاشدا هەموو هۆکارێکی تەکنۆلۆژی‌و پێشکەوتوو سەرچاوەکانی زانیاری بەکار دەهێنێت. مێژووی سەرمایەداری لە جیهاندا ئەو ڕاستیەمان بۆ دەخاتە ڕوو کە عەدالەت‌و دیموکراسیەت‌و بەهاکانی ئازادیش دەخاتە بەر مەترسی‌و بێ ناوەڕۆك کردن‌و هێشتنەوەی بەشێوەیەکی ڕواڵەتی، ئەمەش ئەو ڕاستیەیە کە ئێستا فەیلەسوفەکانی ڕۆژئاوا باسی دەکەن‌و دەیانەوێت وەك یەکێك لە مەترسیەکان لەسەر کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان باسی بکەن.

سەرمایەداری تێڕوانینی بەشێوەیەکە بۆ هەموو شتەکانی دەوروبەر بۆ ئەوەی سودێکی دەست بکەوێت (سەرمایە)، لە ڕێگەی دەست خستنی (قازانجی سەرمایەداری) ئەوەی دەست دەکەوێت کە درێژە بەوە بدات کە سەرمایەکەی دەیەوێت، بۆئەوەی لە حاڵەتێکی هەژمونخوازیدا بمێنێتەوەو باڵا دەست بێت لەرووی داراییەوە[٧٤].

سەرمایەداری نوێ لە هەوڵی ئەوەدایە کە هەموو بوارەکان کۆنترۆڵ بکات‌و بەهەمان عەقڵیەتی سەرمایەو قازانجەوە بچێتە هەموو بوارە نوێیەکانیش. بواری کولتور یەکێکە لەو بوارانەی کە لە ئێستادا سەرمایەداری ڕۆژئاوا لە هەوڵی کۆنترۆڵ کردنیدایەو وەك سەرچاوەیەکی گرنگی قازانجی ئابوری سەیری دەکات، (بۆ ئەم مەبەستە لە ئێستادا کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکان

---

[٧٤] محمد مقدادي: ما العولمة؟، سەچاوەی پێشوو، ل١٢٥

ئەم بوارەیان کردۆتە کایەیەکی گرنگی کارکردنیان، چونکە لەم بوارەدا قازانجێکی خەیاڵی هەیە لە بوارەکانی هونەرو راگەیاندنو سینەمادا).

لەم بوارەشدا توانای کۆمپانیا ئەمریکیەکان زۆر زیاترە لەو توانایەی کە کۆمپانیای وڵاتە ئەوروپیەکان هەیانە، بۆ نموونە کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنانی فیلم لە ئەمریکادا دەتوانێ بە مامناوەندی (٥) ملیۆن دۆلار لەیەك فیلم دا خەرج بکات، کە لە راستیدا ئەم مەبلەغە بە خەیاڵیش بەرهەم هێنەرە ئەوروپیو هیندیەکان ناتوانن بچنە ژێرباریو تەنانەت بیریشی لێ بکەنەوە[٧٥].

سەرمایەداری بە سەرکردایەتی ئەمریکا لە جەنگێکی کولتوری گەرمدایە بۆ غداگیر کردنی کولتورەکانی تر، بۆئەوەی دەست بگرێت بەسەریانداو کولتوری ئەمریکی بکات بە کولتوری هەموو جیهان، لە ئێستادا ئەمریکا کۆنترۆڵی ٦٥٪ی ماددەو بەرهەمی راگەیاندنی جیهانی کردووە، ئەمەش وایکردووە بە ئاسانی دروشمی بەکاربردنو ترساندن بەرز بکاتەوەو بانگەشەشی بۆ بکات[٧٦]. ژمارەی دامەزراوە نێودەوڵەتیەکان لەسەر ئاستی جیهان دەگاتە ٤٠ دامەزراوە، لەم ژمارەیە نیوەیان ئەمریکین، بەم هۆیەوە ئەمریکا بە گەورەترین وڵات دادەنرێت لەرووی پەیوەندیەوە، هەروەها لە بواری کۆمپیوتەریشدا یەکەمە، لەرووی راگەیاندنەوە هیچ کێبڕکێ کەرێکی لە بەرامبەردا نییە. ئەمەش ئەو راستیەمان بۆ دەردەخات کە ئەمریکا زۆر بە روونی سەرکردایەتی راگەیاندنی جیهانی دەکات، بەیەکداچوونی راگەیاندنیش لەگەڵ تەکنۆلۆژیای کۆمپیوتەرو پەیوەندی تواناکانی ئەمریکا بۆ زیاتر

---

[٧٥] هانس بيتر مارتين و هارالدشومان: **سەچاوەی پێشوو**، ل٤٨

[٧٦] د.حسين عبدالهادي :العولمة النيوليبرالية، **سەچاوەی پێشوو**، ل١٩٣..

کردنو بەردەوام بوونی لە درێژەدان بە هەژموونی خۆی لەسەر راگەیاندن زیاد دەکات(٧٧).

لە داهاتوودا کێبڕکێکان لەسەر ئەوە نابێت کە کێ کالآکانی وەبەردەهێنێت، بەڵکو کێبڕکێکە دەچێتە نێوان ئەوانەی کە توانای بەرهەمهێنانی تەکنۆلۆژیایان هەیەو پاشان بەکاری دەهێنن لە زیادکردنی بەرهەمو چاککردنی جۆرەکانیدا، لەبەرئەوە گەلانی بەتوانا لەسەر داهێنانو زیادەکاری ئەو گەلانەن کە کلیلی بازاڕیان بەدەستە، ئەمەش بۆ دورو نزیكو هەژارو دەوڵەمەند وەك یەك وایە(٧٨). لەبەرئەوە ئێمە دەتوانین بۆ ئەم مەبەستە هیند وەك نموونە وەربگرین، (سەرەڕای ئەوەی کە ئەمریکا بەرهەم هێنەری یەکەم نییە لە بواری سینەمادا، چونکە هیندستان حەوت جار زیاتر لەم بوارەدا رۆڵی هەیە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەمریکا هەژموونی خۆی بەسەر هەموو بازاڕەکاندا سەپاندووە(٧٩).

لە ئێستادا سیستمی کولتوری باڵادەست (لە سەردەمی بەجیهانیبوونی کولتوردا) بریتییە لە سیستمی بیسراوی بینراو – کە ئەمڕۆ ئەم سیستمە لە دەیان ئیمپراتۆریەتی راگەیاندنی هێرشبەردا خۆی دەبینێتەوە، کە رۆژانە بە ملیۆنەها وێنەی لێوە دەردەچێت، کە سەدان ملیۆن کەس بەکاری دەبەنو وەری دەگرن لە سەرتاسەری جیهاندا، ئەم بەرهەمانە بەکاردەهێنرێن وەك ماددەیەکی دروستکەر یان جوانکاری.. هتد(٨٠) بەجیهانیبوونی کولتور پشت نابەستێت بە ژێرخانێکی فیکریو عەقڵانی نوسراو، لەگەڵ هەر

---

(٧٧) المصدر نفسه،ص٢٩٨

(٧٨) د.محمد مقدادي:العولمة سيف واحد ورقاب متعددة، ، **سەچاوەی پێشوو**، ل٢٥

(٧٩) منجي الزيدي: الثقافة والمال .. **سەچاوەی پێشوو**، ل٦٩

(٨٠) عبد الاله بلقريز :العولمة والهوية الثقافية :مصدر سابق، ، ل٣١٥

بەرەوپێشچوونێکی بەجیهانیبوونی کولتوردا کولتوری نووسین رو لە پاشەکشە دەکات، لە جێگەی ئەودا کولتورێکی تر دروست دەبێت کە کولتوری وێنەیە.

"لەم سەردەمەدا وێنە بۆتە ماددەیەکی کولتوری کە زۆرترین ڕێژەی بەکاربردنی هەیە"، ئەمەش بە تواناترین هۆکارە کە توانای هەڵوەشاندنەوەی بەرگری کولتوری سروشتی هەیە[٨١]. لە ئێستادا هەوڵێك لە ئارادایە بۆ سەرقاڵکردنی مرۆڤ بە شتی بچوكو بازاڕی، (لەم رێگەیەوە دەیانەوێت لەلایەك وشیاری تاك سادەو ساکار بکەنەوە واتە بەشێوەیەکی روکەش‌و بە شێوەی وانە بڕوانیتە روداوەکان بۆئەوەی دیمەنەکان شێوازێکی راگەیاندن بەخۆوە بگرن). هەستەکان زوو تووشی هەڵچوون دەکاتو عەقڵ دادەپۆشێ‌و لەم رێگەیەشەوە کۆنترۆڵی هۆشیاری تاکەکان دەکات. بەهۆی ئەمەشەوە عەقڵ لەکار دەکەوێت، دەیانەوێت بەم شێوەیە خۆی بگونجێنێت لەسەر دروستکردنی بەهاو ئاراستەکردنی خەیاڵو سنور دانان بۆ زەوق‌و لە قاڵبدانی رەوشت. واتە لێرەدا ئامانجەکە یەك شتە ئەویش رێزگرتن‌و گرنگیدانە بەیەك جۆر لە مەعریفەو شمەكو کەلوپەل، ئەم مەعریفە بازاریە ئامانجی بەروکەش کردنی هۆشیاریە. شمەکە بەکاربەرەکانیش رێگە لە پاشەکەوتو گەشەپێدان دەگرن[٨٢]. وێنەکان لێرەدا تەنها شێوەیەك نین، بەڵکو لەوە زیاترن، ماددەیەکە پڕە لە گوتارو پەیامو تەعبیر، بەڵێ لە رویەکەوە شێوەیەکە بە جۆرێك دەخرێتە بەردەم بەکاربەرەکان کە هەموو مەرجەکانی سەرنج راکێشان‌و هۆگربوونی تیادایە[٨٣].

---

[٨١] عبدالاله بلقريز:النظام الأعلامي السمعي-المصري الغربي والأحتراق الثقافي:نحو استراتجيا جديدة للدفاع الذات،في ندوة(اشكالية العلاقة الثقافية مع الغرب)،مركز دراسات الوحدة العربية،بحوث ومناقشات،ل٢٢٨

[٨٢] د.محمد عابد الجابري:المسألة الثقافية، **سەرچاوەی پێشوو**، ل١٩١-١٩٢

[٨٣] عبد الاله بلقريز :العولمة والهوية الثقافية، **سەرچاوەی پێشوو، سەرچاوەی پێشوو**، ل٢٢٨

بەرهەمە كولتوریەكان، بەشێوەیەكی گشتی بەتایبەتیش لەوكاتـەوە، كـە لیبرالیزمە نوێیەكان كۆنترۆڵیان كردووە لە بەها مرۆییەكانی تـرازاوەو بوەتـە كەرەسـتەیەكی بـازاڕ "چـونكە لـە ئێـستادا بەرهەمـە كولتوریـەكان بـەمانا فراوانەكـەی وەرزش، میـوزیكی جیهـانی، سـینەما، هـەموو ئەمانـە ئێـستا كەوتوونەتـە دەسـت خـاوەن سـەرمایە زەبەلاحـەكان لەبەرئـەوە جێگـەی سەرسـوڕمان نییـە كـە نموونـە كولتوریـەكان بـەرەو قربـوون بـچن، بـەم هۆیەشـەوە روكـەش بـوونو لاوازیو سـادەبوونەوە بوەتـە سـیمای ئـەم بەرهەمانە"[٨٤] لەوكاتەوە كە بەرهەمە كولتوریەكان وەك كەرەستەیەكی بازار مامەڵـەیان لەگەڵدا دەكرێـت، ئێـستا ئـەم بـوارە بوەتـە بـوارێكی ململانێـی سەخت لە نێوان كۆمپانیا گـەورەكانی جیهـان، چـونكە قـازانجی ئـەم بـوارە لەپێش زۆر بواری ترەوەیەو بەكاربەرێكی بێ شوماری هەیەو تەنانەت ئێستا تەلەفزیۆنەكانو میدیاكان بەگشتی سەرچاوەی پەیداكردنی بازاڕن.

بەپێی سەرژمێریو راپۆرتە نێودەوڵەتیەكان، بازرگانی جیهانی لـە بـواری بەرهـەمو خزمەتگوزاریـە كولتوریـەكان، لـەم ٢٠ سـاڵەی دوایـدا چـوارجارە بوّتەوە. ئەگەر سەرنج بدەین كە مامەڵە بازرگانیەكان لـە بوارەكـانی كتێـبو گۆڤـارو مۆسـیقاو هونـەری وێنەكێـشانو سـینەماو رادیـۆو تەلـەفزیۆنو یاریەكانو هۆكارەكـانی وەرزش قازانجـەكانیان زیـادی كـردووە، لـە ٩٥,٢٤٠ بۆ ٣٨٧,٩٢٧ ملیۆن دۆلاری ئەمریكی لە ساڵەكانی نێوان ١٩٨٠ — ١٩٩٨ز.

ئەم بەرەوپێش چوونو قازانجە دەگەڕێتەوە بۆ برەوپەیـداكردنی مـاددەو بەرهەمەكانی بیستراو و بینراو و بەرنامە میدیاییە جۆربەجۆرەكان كە هەموو ئەمانە لەگەڵ تەلەفزیۆن و كتێبدا بەرهەمی یەكەم بوون بۆ ناردنە دەرەوە لە

---

[٨٤] د.حبيب الجنحاني:ظاهرة العولمة الواقع والأفاق/مجلة عالم الفكر، **سەچاوەی پێشوو**، ل٣٥

ئەمریکادا لەساڵی ١٩٩٦، چونکە لەم ساڵەدا ئاستی مامەڵەکانی گەیشتە ٦٠,٢٠٠ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی بەمەش بوارە تەقلیدیەکانی ناردنە دەرەوەی تێپەڕاند وەك پیشەسازی ئوتومبیلو غەزوی ئاسمانو بەرگری، وە بەپێی ئەو راپۆرتەش کە کۆمەڵەی ئەمریکی ( international intellectual property alliance) ئامادەی کردووە، لە ساڵی ١٩٨٨ باس لەوە دەکات کە رێژەی گەشەکردن لە پیشەسازیەکان کە لەسەر بنەمای مافی نوسەرو خاوەنداری فیکری دامەزراوە لە ساڵی ١٩٧٧ بۆ ١٩٩٦ سێ ئەوەندەی بواری ئابوری نیشتمانی بەرەوپێش چوونی بەخۆوە بینیوە[٨٥] بەرامبەر ئەو هەژموونە گەورەیەی کە وڵاتە رۆژئاواییەکان کردویانە بەسەر کولتوورو بەرهەمەکانیدا، لە بەرامبەر ئەمەدا وڵاتانی باشور تەنها وەك بەکاربەرێك دەردەکەون، ئەمەش رەنگدانەوەی ئەو جیاوازیەیە کە لە نێوان باشورو باکوردا هەیە لە رووی تەکنۆلۆژیو سیاسییو ئابوریەوە. بەپێی سەرژمێریەك نزیکەی ٨٠٪ی سەرچاوەی زانیاریو هەواڵەکان لە ئەو ئاژانسو سەرچاوانەوە وەردەگیرێت کە لە باکورەوە دێت، چونکە ئەوان خاوەن زۆربەی مەوجە رادیۆییەکانو مانگە دەستکردەکانن گرنگترین سیمای کولتوری ئێستا ئەوەیە کە زۆربەی بەشێوەی (وێنە) خۆی نمایش دەکات، کە ئەمەش بەرەوپێش چوونی گەورەیە لە بواری میدیادا، وێنەش کۆمەڵێك تایبەتمەندی خۆی هەیە لەوانەش ئەوەیە کە خۆی لە قاڵبێکی جواندا نیشان دەدات، لە رێگەی ئەو زەوقو جوانیەوە کە هەیەتی کاریگەری لە ناخی مرۆڤ دەکات.

---

[٨٥] المنجي الزيدي: الثقافة والمال ..مصر سابق ، ل٦٨

وێنــەکان کــار لــە غــەریزەکانی مــرۆڤ دەکــەن ئــەو وێنانــە لــە رێگــەی تەکنەلۆژیاو زانستی نوێوە رێك دەخرێن‌و لـەم رێگەیەشـەوە کاریگەریـەکانی زۆرە لەسەر غەریزەکانی مرۆڤو وای لێ دەکات کە بەرەو خـۆی رایبکێـشێت، واتە دەتوانین بڵێین لە وێنەکاندا جۆرە جادوییەك هەیە کە وا لە مرۆڤ دەکـات زۆربەی کاتەکانی بە دیار شاشەکانی تەلەفزیۆنەوە بەسەر بەرێت، ئەم وێنانە کاریگەری تایبەتی خۆی هەیە لەسەر سلوکی مرۆڤەکان، کولتوری وێنە کاری کردوەتە سەر کولتوری خوێندنەوەش، مرۆڤی ئێستا زۆر کەم دەخوێنێتەوە، ئــەوان بــە شــەو و بــە رۆژ ســەرقاڵی وێنــەکانن لــە ئینتــەرنێت‌و تەلــەفزیۆن، کاریگەری لەسەر کولتوری زمانیش دروست کردووە، چونکە زۆربەی گـەلانی جیهان ناتوانن لە یەکتر تێ بگەن، بەڵام بە زمـانێکی هاوبەشـی وێنـە لەگـەڵ یەکتردا تێکەڵاو دەبن، دیمەنەکان‌و فیلمەکان‌و ڤیستیڤاڵو گـۆرانی‌و هونـەر، ئــەو هۆکارانــەی کــە لــە رێگــەی وێنــەوە خۆیــان نمــایش دەکــەن. مانگــە دەستکردەکان سەرکەوتوو بوون لەوەدا کـە زۆربـەی جموجوڵـەکانی جیهـان بخەنـە ژێـر چـاودێری خۆیانـە، لەوەشـدا سـەرکەوتوو بـوون کـە لـە رێگـەی سیستمی نوێی میدیاوە هەڵسن بە گواستنەوەی بـەهاو رەمـزو وێنـەکانی بـۆ نێو رایەڵی ناوخۆی هەر پێکهاتەیەك کە بیانەوێت.

لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئەنجامەکەی هەرەس هێنانە بە ئاسایشی کولتوری کۆمەڵگەکان کە – ئێمە بەشێکین لێی – کە ناتوانرێت بەگری لێ بکرێت[٨٦].

ئەم کولتـورە جیهانیـە کاریگـەری راسـتەوخۆی دروسـت کـردووە لەسـەر شوناس‌و کولتوری لۆکاڵی نەتەوە جیاوازەکان، بەتایبەتیش گەلانی مسوڵمان کە گەلی کوردیش یەکێکە لەو گەلانە، لەبەرئەوە ئەوەی ئەمڕۆ دەیبیـنین لـە

---

[٨٦] هەمان سەرچاوە،ل ٢٣٠

کۆمەڵێك سلوكی نامۆ كە دروست بووەو زۆر دیاردەی كۆمەڵایەتی كە پێشتر لە ئارادا نەبووە، ئەمەش لە زۆر ناوەندەكانی وەك خوێنـدنو خێـزانو لـەناو گەنجانو تازە پێگەیشتواندا دەبینرێت، ئەویش بەهۆی كاریگەری میدیاو ئەو تۆڕە پەیوەندیەیـە كـە هـەموو جیهـانی بەیەكـەوە بەسـتۆتەوە، كۆمەڵگـەی كـوردیش لەبەرئـەوەی لەگـەڵ پێـشكەوتنە تەكنۆلۆژیەكـەوە نـەیتوانیوە لـە ئاستە زانستیو مەعریفیەكاندا گەشە بكات، لەبەرئەوە **دوالیزمەیەك** لـەتاكی كوردیدا دەبینیت، لە روكەشو مۆدێلاتو تەكنۆلۆژیا وادەزانی كۆمەڵگەیەكی مەدەنی پێشكەوتووە، بەڵام لە جەوهەردا هـەمان تـاكی كۆمەڵگـەی كـوردی سەدەكانی رابردووە، ئەوەش دەتوانرێ لە سلوكی رۆژانەیدا بەدی بكەین بـە مامەڵەی لەگەڵ دۆسیەی ژنانو مەدەنیەتو دیموكراسیو گەشـەپێداندا، كـە هەڵگری شوناسێكی جیاواز نییە لەم بوارانەدا. (كولتوری عـەرەبیش بـەهۆی ئەم كارتێكردنەوە گۆڕانێكی قووڵ تیایدا رویداوە كە ئەمـەش بەیوەنـدی بـە ئیرادەیەكی هۆشیارانەوە نییە، ئەمەش بەهۆی ئەو پێشكەوتنانەوەیە كە لـە هۆكانی بەرهەمهێنانو هاتنی كۆمەڵێك تەكنۆلۆژیای نوێ لە بەرهـەم هێنـان، كە ئەمـەش كاریگـەری هـەبوو لـە هەڵوەشـاندنەوەی ژێرخـانی كۆمەڵایەتیـە تەقلیدیەكە، ئەمە سەرەڕای ئەو گۆڕانكاریەش لە بواری كولتـوردا روویـداوە، كە بەهۆی سەرمایەداریەوە كە ئاراسـتەی جیهـانی وەرگرتـووە، توانیویـەتی ببێتــە كولتــورێكی كاریگــەرو بەشــێوەی بەرجەســتە بگوازرێتــەوە، ئەمــە سەرەڕای ئەوەی كە رۆژهەڵات گۆڕەپانی ململانێ بوو، لە دژی ئیمپریـالیزم، هەرچەند هەندێك لە فیكری ئەورویی بەشـێوەیەكی هۆشـیارانە تـوانی خـۆی بخزێنێتە نێو كولتوری عەرەبیەوەو بەمەش ئەو كولتـورە بـو بـە بەشـێك لـە كولتوری داگیركەران ئەمەش بـەجۆرێك بـوو كـە رۆژئاواییـەكان هـیچ خۆیـان

پێوە هیلاك نەكرد، لێرەوە ئێمە نرخی ئەو كولتورەمان بۆ دەردەكەوێت كە لە هەوڵی بەدەست هێنانی ئازادیدایە[٨٧].

لایەنێكی گرنگ لە بەجیهانی كردنی كولتوردا كە بەیەكێك لە سیماكانی سیستمی سەرمایەداری دادەنرێت بە قۆناغە جیاوازیەكانیەوە، ئەوەیە كە دەیەوێت مرۆڤ بكاتە كاڵاو وەك شمەكی بازاڕ مامەڵەی لەگەڵدا بكاتو بیخاتە ناو بازاڕی كێبڕكێی ئازادەوە، ئەوەیش لە روانگەی ئەوەوە كە مرۆڤ خاوەنی ئازادی خۆیەتیو بە ئازادیش دەتوانێت هێزی كاری خۆی بفرۆشێت بەهەر وەبەرهێنەرێك بێت ئەویش بەو مەرجەی ملكەچی یاسا گشتییەكانو بنەما سەرەكیەكانی سیستمی سەرمایەداری ئێستا بێت[٨٨].

بەهۆی ئەم بارودۆخە نوێیەوە كە لە دەرەوەی خۆیەوە بۆی دێت، تاكەكانی ئەم كۆمەڵگایانە لەلایەك بەردەوام لە دوودڵیو ترسدا دەژین، لەلایەكی ترەوە كە سەیری بارودۆخی ژیانی خۆی دەكات لەرووی كولتوریو سیاسییو ئابوریەوە، بەردەوام هەستێكی خۆ بەكەم زانینی لەلا دروست دەبێت، بەمەش **دوالیزمەیەك** روودەكاتە كەسایەتی ئەم تاكە، لەلایەك دەیەوێت وەك كەسێكی كۆمەڵگای خۆی بمێنێتەوەو پابەند بێت بە ترادسیۆنە تەقلیدیەكەی، لەلایەكی ترەوە بەرۆتین دەیەوێت ببێتە كەسێكی مەدەنیو شارستانی بە شێوازی رۆژئاوایی.

لەبەرئەوە دەبینین ئەم كۆمەڵگایانە وەك جەوهەری خۆیان دەرناكەون، دەسەڵاتدارانیش لەم وڵاتانەدا، لەبەرئەوەی خاوەنی پلانی ستراتیجی درێژخایەن نینو تەنها لە هەوڵی پاراستنی كورسیەكانیاندان لەبەرئەوە

---

(٨٧) جیهان سلیم:العولمة الثقافة والأسترتجیات التعامل في ظل العولمة، **سەچاوەی پێشوو**، ل١٢٣.

(٨٨) معتز جیسو :تجلیات العولمة الثقافیة،http://www.mokarabat.com/s1894.htm١٨/١/٢٠٠٧

نـاتوانن خـاوەنی بەرنامەیـەکی گەشـەپێدان بـن، کـە ڕێگـری لـەو بەشـەی کولتورە جیهانیەکە بکەن، کە کاریگـەری سـلبی بۆسـەر شوناسـی کولتـوری گەلـەکانیان هەیـە، لـەم کۆمەڵگایانـەدا، تاکـەکانی یـان بـە پرۆسـەیەکی قۆناغبەندی شکست دەخۆنو توشی قەیرانی شـوناس دەبـن، یـان دەکەونـە پەراوێزی گۆڕانکاریە جیهانیەکانو تەنها بـاس لـە رابـردوو مێـژوو ترادسـیۆن دەکەن، کە ئەمەش مـەرگێکی لەسـەر خـۆی کۆمەڵگەیـە، ئـەم کۆمەڵگایانـە نـاتوانن بەشـداری جـدی بکـەن لەگـەڵ ئـەو پێـشکەوتنانەی کـە ئێـستا لـە ئارادایە. چونکە خاوەنی ئـەو ئالیەتـە نـین کـە پێویـستە لـە ئـارادا بێـت بـۆ بەشداری یان کۆمەڵگەکەیان لە ئاستی ئەو پێـشکەوتنانەدا بێـت کـە بتـوانن کولتورێك بەرهەم بهێنن کە جورئەتی بەشداری هەبێت لەم پرۆسـە نوێیـەدا. زۆر گرانە تاکێك لەم وڵاتانەی باشور بتوانێت مامەڵـە لەگـەڵ ئـەم بارودۆخـە نوێیەدا بکات، چونکە بنەماکانی ئەم کولتورە نوێیە زۆر دورە لەگـەڵ بـەهاو پێکهاتەکانی کولتوری ئەم گەلانەدا، کۆمەڵێك بنەمای نوێ هەیە لە کولتوری بـەجیهانی بـوودا، کـە زۆر دورە لـە ئاسـتی گەشـەو جەوهـەری پێکهاتـەی کۆمەڵایەتیو فیکریو مەعریفی دا.

کولتوری بەجیهانیبوون خاوەنی هیچ بەهایەکی ئەخلاقی نییە، بەڵکو ئەو تەنها لەپێناو قازانجـدا کـار دەکـات، هەمووشـتێك دەکرێتـە شمـەك، کـڕینو فرۆشـتنی پێـوە دەکرێـت لەبەرئـەوە مەترسـی گـەورە لـە بـواری کولتـوری کۆمەڵایەتیدایە بەتایبەتی بۆسـەر هـەردوو دامـەزراوەی خێـزانو پـەروەردە، چونکە ئەم دوو دامەزراوەیە ناتوانن بەم ژێرخانە تەقلیدیەوە خۆیان بگرن لە بەردەم ئەو دامەزراوە میدیاییە کولتوریە نوێیەدا، کە لـە پـشتیەوە هـەزاران کۆمپیانیاو کەسانی پسپۆڕو دامەزراوە زەبەلاحە ئابوریو سیاسییەکان هەن،

ئەم بارودۆخە نوێیـە، حاڵـەتێکی شـڵەژانی لـەناو کۆمەڵگـە نارۆژئاواییەکانـدا دروسـت کـردووە بەتایبـەتی لـەناو کۆمەڵگـە مـسوڵمانەکاندا، چـونکە ئـەم بۆچوونو ئامانجـە کولتوریانـە راسـتەوخۆ بەریـەك کـەوتن لەگـەڵ شـوناسو کولتـوری لۆکاڵیـدا رو دەدات، چـونکە لـەم کولتورانـەدا جۆرێـك لـە بـەهای مرۆیـیو ئـاینی هەیـە کـە تاکـەکان نـاتوانن دەسـت بـەرداری بـبن، ئـەو کاریگەریەی کە ئەو کولتورە رۆژئاواییە کردوویەتی نموونەیەکی مەترسیداری دروست کردووە، کە زۆرتـر کاریگـەری لەسـەر دامـەزراوەی ئـەویتر کـردووەو بەشێك لە گـەنجان لـە وەرگرتنـی ئـەو شوناسـەدا بوونـە نموونـەی بـرەودان بەکاری بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەرو، زیـاد بـوونی دیـاردەی لەشفرۆشـیو زیادبوونی دیاردەی توندڕەویو خۆکوژیو بڵاوبوونـەوەی چـەندان دیـاردەی نـامۆ، کـە ئەمـە وایکـردووە ئـەم کۆمەڵگایانـە بـە مەترسـییەوە سـەیری بەجیهانیبوونی کولتور بکەن کە لە راستیدا کولتـوری لیبراڵیزمـی رۆژئاوایـەو دەیەوێت بیکەن بە کولتوری هەموو گەلانی جیهان.

(جۆزیە بۆفیە) سەرکردەی فیدراڵیە کشتیارەکان لـە فەرەنسادا یەکـەم کـەس بـوو کـە دروشمـی نـا بـۆ بـەکاڵاکردنی کولتـورو پـەروەردەو دروسـتی بەرزکردەوە، ئەولەو بڕوایەدا بوو کە نابێت نە جیهـانو نـە ئێمـەش بکرێینـە کاڵاو کڕینو فرۆشتنمان پێوە بکرێتو تەنها لە روانگەی قازانجەوە سەیرمان بکرێت.

گـرنگترین کاریگـەری کولتـورو میـدیای بـەجیهانی بـوو لـە بـواری هونـەردا دەردەکەوێت، لە ئێستاشدا زۆرینەی کەناڵە ئاسمانیەکانو تۆڕەکانی ئینتـەرنێت کەوتوونـە ژێـر ئـەم کاریگەریـەوە، بەتایبـەتی لـەو روەوە کـە هونـەر پەیوەسـت کراوەتەوە بە جەستەی روتەوە کە ئەمەش بەشێکە لـە گوتـاری نـوێی کولتـوری

بەجیهانیبوون کە دەیەوێت لەگەڵ جەستەی ئافرەتدا وەك شمەكو كاڵا مامەڵـە بکاتو لەم بوارەشدا سەرکەوتوو بووەو ئێستا ئـەم دیاردەیـە بۆتـە دیاردەیـەکی جیهانی، توانیویەتی ئەو بابەتە بکاتـە ماددەیـەکی کولتـوریو لـە هـەمان کاتـدا وەك سـیمایەکی پێـشکەوتنی کۆمەڵگـە بناسـێنێت، ئەمــەش گەڕانەوەیـە بـۆ هەندێك لە فەلسەفە کۆنەکان کە وایـان لـە قەڵـەم دەدا ڕزگـارکردنی جەسـتە لـە داپۆشین دەبێت بە رزگار بـوون لـە ئـاین دەسـت پـێ بکـات، لەبەرئـەوەی رووت بوونــەوەی ئافرەتیــان بــە رێگــەی رزگــاری لــە قەڵــەم داوە، لــەم روانگەیــەوە دەتـوانین بڵـێین گوتـاری وێنـە لـە ئێـستادا تەعبیرکردنـە لـە دووشـت، لەلایـەك رووتکردنەوەی جەستە لە لایەکی تریشەوە روت بوونی کولتور.

ئەوەی ئەمڕۆ لە کۆمەڵێك کەناڵی فەزایی عـەرەبیو کـوردیو تـورکیو .. هتد، دەبینین بە ئاگایی بێت یان بێ ئاگایی، بڕەودانە بە ئەو کولتورە ئاست نزمەی کە بە هاوکاری لەگەڵ بازرگانو کۆمپانیاکانی بواری میدیاو کارکردنـە لەسەر گەنج بۆئەوەی بە تەواوی لەم بوارە کولتوریە بازاڕیەدا تەواو سـەرقاڵ بکرێن، کە بێجگە لـە دەسـتکەوتنی سـەرمایە لەلایـەن کۆمپانیاکانـەوە هـیچ شوێنکارێکی لەسەر گەشەو بەرەوپێش چوونو داهێنان نییـە، ئەگـەر سـەرنج بدەین دەبینین دەیان کەناڵی کلیـپو گـۆرانی کـە رۆژانـە پـەخش دەکرێـت، لەســەر کەرەســتەی جەســتەی رووتــی ئــافرەت کــار دەکــاتو لــە ئــەم رێگەیەشەوە سەرنجی بینەر بـەلای خۆیـدا رادەکێـشێت، چـەندان بەرنامـەی پێـشبڕکێی گـۆرانی دانـراوەو زۆرینـەی جـەماوەری ئـەم وڵاتانـەیان سـەرقاڵ کردووەو چاوەڕێی ئەوەن چ گۆرانی بێژێك پێشبڕکێیە دەباتەوە، برەودان بە هونەری گۆرانی لە ئێستادا بوەتە کارێکی بەرنامە بۆ داڕێژراوی ئەو کەناڵانە، ئەمەش نەك لەبەر برەودان بێت بە ئاستی هونەری گۆرانیو میوزیـك، بـەڵکو

پرۆسەیەکی بازرگانیەو لە دیوێکی ترەوە وێران کردنی ئـەو بـەها جوانانەیـە کـە لـە هونـەری مۆسـیقاو گـۆرانی کلاسـیکدا هـەبوو، ئەمـەش بـەناوی پێشکەوتنو مۆدێرنەو بەجیهانیبوونەوە، ئەگەر سەرنجی هەریەك لە سـتایلی گۆرانیەکانو کلیپەکان بدەینو لەوێوە سەیری ئـەو کەسـایەتیانە بـدەین کـە رۆڵی تێدا دەبینن هەروەها لە نەغمەی گۆرانیەکان سەرنج بـدەین تێدەگـەین کە لە ئەم رێگەیەوە چ هـەولێك دەدرێـت دژ بـە مۆسـیقاو هونـەری رەسـەنی نەتەوەیی رۆژهـەڵات بـە گـشتی، کەواتـە ئـەم شـێوازە لـە چـالاکی هونـەری دیوێکی تری کاری رۆژهەڵاتناسە نوێیەکانـە لەسـەر هونـەر، هـەتا لـە دیـدی نەوەی نوێدا شتێك نەهێڵن بەناوی کولتوری خۆمـاڵی یـان مۆسـیقاو گـۆرانی رەسەنو کلاسیكو بە چاوێکی سـوکەوە مامەڵـەی لـە گەڵـدا بکـەنو دانـسو خێراییو روتی بکەنە سیمایەکی نوێ بۆ گۆرانیو رۆژانەش گەنجان سەرقاڵی ئەم جۆرە گۆرانیانە بن.

ئەمە بە دیوێکی تردا کاریگەری دەبێت لەسـەر ئـەوەی کـە نـەوەی نـوێ نەوەیەکی نامۆ بێت بەتایبەتمەندیە کولتوریە نەتەوەییـەکانو ببێتـە بەشـێك لە نەسیبحی کۆمەڵگەی رۆژئاوایی، بەڵام بـە پـەرێزیو پاشـکۆیی، واتـە ئـەو گەنجەی کە خاوەنی شوناسێك نییەو لـە قەیرانـدا دەژی وەك قـەرەجێکی لێ دێت کە هەڵگری هیچ ناسنامەیەك نییـەو هـەر رۆژە دەچـێتە سـەر کولتـوری گەلێك، ئەویش دەرگای بەرودا ناکەنەوەو بەنائومێدی دەگەڕێتەوە یان تەنها پارچە نانێکی دەدەنێ هەتا لە برسا نەمرێت.

لەلایـــەکی تریـــشەوە ئەمـــە ئـــەو راســـتیەمان بـــۆ دەردەخـــات کـــە دەسەڵاتدارەکان لەم وڵاتە ئیسلامیو ئاسیاییانەدا خـاوەنی بەرنامەیـەك نـین بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ ئەم سەرمایە گەورەیەدا کـە توانـای گەنجەکانیـەتی،

لەبەرئــەوە بــۆ خۆپاراســتن لێیــانو ســەرقاڵکردنیانو دورخــستنەوەیان لــە روبــەروو بوونــەوەی دەســەڵات، حــەز دەکــەن گــەنجان روبکەنــە بوارەکــانی مۆســیقاو گــۆرانیو مــاددەی هۆشــبەرو خواردنــەوەو.. هتــد، بــەڵام ئەگــەر ســەرنجی شۆڕشــەکانی بــەهاری عــەرەبی بــدەین ئــەو راســتیەمان بــۆ رون دەکاتــەوە، کــە ســەرقاڵی کردنــی گــەنجان لــەو بوارانــە نــەیتوانی کێــشە جەوهەریەکانی وڵات لەبیر گەنجان بباتەوە، چونکە ئەگەر بەشێك لە گەنجان توانرابێت بەو بوارانەوە سەرقاڵ بکرێن ئەوا کۆمەڵێکی تر لــە گــەنج هــەبوون کــە نەکەوتنــە ژێــر تــۆڕی ئــەو پلانــەو توانیــان لــە دەرەوەی دا بمێننــەوەو هەڵگری خەمــە گــەورەکانی نیــشتمان بــن وەك دیموکراســیو ئــازادیو مــافی چارەی خۆ نوسینو دادپەوەریو چەسپاندنی مافەکانی هــاوڵاتی، لەبەرئــەوە دواجــار ئــەو سیاســەتەی دەســەڵاتە ســتەمکارەکان شکــستی خــواردووەو گەنجان بە توڕەییەکی بێ وێنەوە روبەڕووی ئەو دەسەڵاتە گەندەڵە تاکڕەوە نا دیموکراتە بوونەوەو لە ماوەیەکی کورتدا کۆتاییــان بــە دەســەڵاتی دەیــان ساڵەی پڕ لە گەندەڵیو ستەمکاریان هێنا. (عەلی حەرب) لە رۆژنامەی سەفیر لە ٢٠٠٤/٦/٢٤ دا دەڵێــت: "ئەگــەر مــرۆڤ بــە چــاوی سلبیەوە بروانێتــە ئــەم دیاردەیە ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە ئەمە بەڵگەیە لەسەر هەژاری کولتوریو دارزانی هونەر، بەڵکو هەندێکیش باس لە مردنی کولتورو بەکاڵاکردنی عەقڵو جەستە دەکەن، ئەمــەش بــە ئــەنجامێکی خراپــی ســەردەمی بــەجیهانیبوون دەزانن"[٨٩]

ئەم بارودۆخەی کە بەسەر هونەرو کولتــوردا هــاتووە، بــەهۆی کاریگــەری بوونە بە کولتورە ئەمریکیو ئەوروپیەکەوە، چونکە لە ئێــستادا ئەنتــەرنێتو

---

[٨٩] د.سعيد اللاوندي :بدائل العولمة، سەچاوەی پێشوو، ل٤٧

کەناڵە فەزاییەکانو فیلمەکانو کۆمپانیاکانی ڕێکلامی بازرگانی بە درێژایی ٢٤ سەعات کاردەکەنو بەبێ وەستان کولتوری خۆیان پەخش دەکەنو لەم وڵاتانەشدا بینەر بەدیار شاشەکانەوە دانیشتووەو بەبێ پرسیارو ڕەخنە بەرهەمەکانی ئەوان وەردەگرێت.

"ئەگەر سەیری ئەفلامە ئەمریکیەکان بکەین دەبینین کە رووتی یەکێکە لە بنەما سەرەکیەکان لە بەرهەم هێنانی ئەخلاقەکانی بواری رەوشتو کۆمەلایەتیو سیاسەت، زۆر بە دەگمەن فیلمێکی ئەمریکی دەبینین کە بەشێکی تایبەت نەبێت بە بەدڕەوشتی، کە ئەمەش برەودانێکە بە لەشفرۆشی، رۆژنامە ئەمریکیەکانیش دان بەو راستەیدا دەنێت کە پیشەسازی لەشفرۆشی یەکێکە لە هۆکارە گەورەکانی بەدەستهێنانی سەرمایە لە هۆلیود دا، کە لە ئێستا کەرتێکی بەرهەمهێنانی ئابوری گرنگ لە کەرتەکانی ئابوری ئەمریکی پێك دەهێنێت، ئەم بەرهەم هێنانە شارستانیو بەهایانە لە کۆمەڵگەی ئەمەریکیدا وای لە بیل کلینتۆن کرد کە لەبەرامبەر ٢٨٠ ملیۆن ئەمریکیدا بوەستێتو بەروونی باس لە پەیوەندیە سێکسیەکانی خۆی بکات لەگەڵ مۆنیکا لوینسکی، ئەمەش هەمووی لە رێگەی ئینتەرنێتەوە بلاوکرایەوە"[٩٠]

کولتوری هۆلیودی، ئەو کولتورەیە کە هەڕەشەیە لەسەر کولتورە نائەمریکیەکان، چونکە ئەو بەرهەمانەی کە دەریان دەکات رەنگدانەوەی کۆمەڵگایەکی بێ بەهایە لە روی ئەخلاقیەوە، هەروەها وێناکردنی کۆمەڵگەیەکی شپرزی توندوتیژی بێ مێژوو بێ کولتورو بێ بەهای مرۆییە. ئەمریکیەکان نە خاوەنی کولتورێکی رەسەنن نە شارستانیەتێکی مرۆییان

---

[٩٠] الشيخ جعفر عتريسي:العولمة والعالم،إدارة وأدوات،دار جمعة البيضاء للطبع والنشر والتوزيع،بيروت لبنان،چ١، ٢٠٠١،ل٣٨٦

هەبووە، نە مێژوویەکی دیارو نوسراویان هەیە، زەویەکانیان داگیرکردوەو دانیشتوانە رەسەنەکانیان کوشتوەو پاشماوەو کولتورو شارستانیەتی ئەوانیان وێران کردووە، گەورەترین جینۆسایدی لە مێژوودا کە هەبێت بە وتەی چۆمسکی ئەمریکیەکان ئەنجامیان داوە، لەبەرئەوە لە جەوهەردا مرۆڤو بەهای بالاّو ئەخلاق لەلای ئەوان بوونێکی نیە، ئەوان کۆمەڵێك بازرگانی گەورەبوون کە لەسەر خوێنی مرۆڤە بێ تاوانەکان ئەوەیان دروست کردووە کە پێی دەوترێت ئەمریکا، ئەوان لە رێگەی هۆلیودەوە توانیویانە بازاڕێکی جیهانی دروست بکەن بۆ قازانج ساڵانە ملیارەها دۆلار قازانجی ئەم کۆمپانیا زەبەلاحانە، لێرەدا هەموو شتێك قابیلی کڕینو فرۆشتنە لەگەڵ هەموو شتێکدا وەك کەرەستەو شمەك مامەڵە دەکرێت ئەمە عەقڵی جولەکەکانی ئەمریکایە، کە لە هۆلیوددا خۆی بەرجەستە دەکات، و ئەمریکاش لە رێگەی هۆکارەکانیەوە لە ئەلکترۆنو تەکنۆلۆژی پێشکەوتوو پەخشی دەکات.

بەجیهانیبوونی کەلتور وەك هەندێك لە لایەنگرانی کولتوری رۆژئاوایی دەڵێن قەدەری گەلان نییەو بەڵکو پەیوەستە بە هەندێك هۆکارەوە بەتایبەتی لە بواری گەشەپێدانی مرۆییەوە، هەر گەلێك چەند بەشداربێت لە بنیاتنانی شارستانیەتی نوێداو هەوڵی دروست کردنی مرۆڤی نوێ بدات، دەتوانێت ببێتە خاوەنی کولتورێکی زیندوو داهێنەرو لە کولتورەکانی تردا نەتوێتەوەو پارێزگاری لە سەربەخۆیی خۆی بکات.

ئەگـەر سـەیری دیـدو تێڕوانینـی ڕۆژئاواییـەکان بکـەین لـە شـێوازی دیـدو تێڕوانینیان بۆ ئەوانی تر لەڕوی کولتوریەوە، ئەوکاتە تێدەگەین کە ئایا ئـەم کولتورە جیهانیە بەهەمان چاو سـەیری هـەموو نەتـەوەو گەلـە جیاوازەکـان دەکـات، یـان هەوڵێکـە بـۆ هـەژموونی کولتـورێکی دیـاریکراو بەسـەر کولتورەکـانی تـردا، لـە ڕوانگـەی ڕۆژئاواییەکانـەوە کولتـور ڕۆڵێکـی گـرنگ دەگێڕێـت لـە کایـەی بەجیهانیبوونـدا، چـونکە لـە ئێـستادا ئـەویش وەك هۆکارێکی گرنگ بۆ پەیداکردنی هەژموونی زلهێزەکان بەکار دێت، بـەڵام لـە ڕێگەیەکی ترەوە کە جیاوازە لە داگیرکاریە تەقلیدیەکانی سەدەی ڕابردوو.

لەگـەڵ سـەرەتای هـەزارەی سـێهەمدا، فیکرەیـەك هـەبوو کـە بـەردەوام کۆمـەڵێك لـە تیۆریـسینە ڕۆژئاواییـەکان دووبارەیـان دەکـردەوە، ئـەویش ئـەوەبوو کـە دەیـانوت لـە پـاش کۆتـایی هـاتنی بـەجیهانیبوونی ئـابوری، هەنگاوی دووەم بەجیهانی بونی کولتورە کـە ئەمـەش بـە بنەمایـەکی بـەهێز دادەنرێت بۆ پشتیوانی کردن لە سیستمی نوێی جیهانی[٩١].

لێـرەوە ئـیتر هەنـدێك ئیعتبـاراتو هۆکـاری ئایـدیۆلۆژیو ئـەمنی پاشەکـشەیان کـرد کـە پێـشتر ڕۆڵـی گـەورەیان هـەبو لـە دیـاریکردنی چارەنووسی گەلانـدا، لـە ئێـستادا گرنگـی دانو جـەخت کردنـەوە زۆر بـووە لەسەر هۆکـاری کولتـوری، ئـەوەش وەك هێزێکـی کاریگـەر، کـە پاڵنـەرێکی بەهێزە لە کاروباری مرۆییو پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا، ئـەم گرنگـی دانـە گەیشتۆتە نـاو زۆر کتێـبو توێژینـەوە، وە کۆمـەڵێك تیـۆریش کـە بـاس لـە کاریگەری هەردووکیان دەکات، هەرچەند لەو ڕووەشەوە جیـاوازن لـە بـارەی

[٩١] جیهان سلیم: عولمة الثقافة و استراتیجیات التعامل معها، مجلة مستقبل العربي، سەچاوەی پێشوو، ل١٢

ڕۆڵـی کولتـور، لـە دارشـتنەوەی هـەڵس‌و کـەوت‌و سـلوکی کۆمەڵگـەکان‌و دیاریکردنی جۆری پەیوەندیەکانیان[٩٢].

لە سەرەتای دەرکەوتنی هەر سیستمێکی جیهانیدا، یەکسەر روناکبیرو تیورسینە رۆژئاواییەکان کۆمەڵێك دیدو بۆچوونی نویَ بڵاو دەکەنەوە، کە لە هەموویدا باسکردنە لە رۆڵی گرنگی شارستانیەت‌و پیاوی سپی لـە بەرامبـەر ئەوانی تردا کە چاورەش‌و قژ رەشن.

ئـەو کتێـب‌و دانراوانـەی کـە پێـشکەش کـران وەك (کۆتـایی مێـژوو)ی فۆکۆیاما، ( ململانێی شارستانیەکان)ی هانتینگتۆن‌و سـەرکەوتن‌و دابـەزینی زلهێزەکان کە لە نووسینی (بول کینیدی)و شارستانیەتی شەپۆلی سێهەم، لە نووسینی (تۆفلەر). "(لە دەرەوەی سـنورەکان)ی (بریجنـسکی)و (ئـاژاوەی دوای جەنگی سارد) لە نووسینی (رۆبەرت کایلان)، چەندان کتێبی تریش کە لەم ساڵانەی دواییدا دەرکەوتن، ئەمەش لە چوارچـێوەی دارشـتنی پـرۆژەی فیکری وڵاتـانی پێـشکەوتودا دێـت، بۆئـەوەی لـە سروشـتی هەنوکـەیی ئـەم شارستانیەتە تیَ بگەیت‌و ئاسۆکان‌و خزمەتـەکان‌و رێگرەکـانی ئاینـدە روون بکاتەوە"[٩٣]

بـاری بـوزان دەڵێـت "ئەگـەر راسـتییەکی جەوهـەری بڵـێین ئەوەیـە کـە وڵاتانی سەنتەر (رۆژئاوا) لە ئێستادا سـەروەرییان زۆرتـرەو کـەناریش زیـاتر کەوتۆتە پەراوێزەوە"[٩٤]

---

[٩٢] **هەمان سەرچاوە**،ل١٢١

[٩٣] د.محي محمد مسعد:ظاهرة العولمة،الأوهام والحقائق، القاهرة،مكتبة الأشعاع،١٩٩٩،ل٤٣

[٩٤] صموئيل هنتنجتون:صراع الحضارات، **سەچاوەی پێشوو**، ل١٣٧

لــه دوای ســاڵی ١٩٩١ (هەرەســی یــەکێتی ســۆڤیەتو لێــدانی عێــراق) پاشــکۆیی گــۆڕا بــۆ ملکەچــی، ئەمــەش لەکاتێکــدا بــوو کــە هــەژموونی سەرمایەداری گۆڕا بۆ دەست بەسەردا گرتن، کـە لـەم کاتـەدا زۆرتـر پـشت دەبەستێت بە هۆکارە سەربازیو ئابوریو سیاسییەکان، بۆئەوەی هەژموونی خۆی فـەرز بکـات، بۆئـەوەی دەسـەڵاتی خـۆی یـان ئـیرادەی سـەرمایەدارە رۆژئاواییەکان فەرز بکات، ئەویش لەپێناو بەرز کردنەوەی ئیرادەی سەنتەرە سەرمایەدارەکەیە بەسەر کەنارە کەنارکەوتووەکاندا، لەبەرئەوە ئێمە لێـرەدا دەتوانین بڵـێین لـە سـاڵەکانی نـەوەدەوە پـەیوەنـدی نێـوان ئـەم دوو لایەنـە پەیوەنـدی (هــەژموونو ملکەچــییە)[٩٥] رۆژئاواییــەکان جــۆرێکی گونجــاوو یەکسان نارەخسێنن بۆ هەموو نەتـەوەکان بۆئـەوەی هەریەکـەیان کولتـوری خۆیان تیادا نمایش بکەن. یـان لـە رێگـەی لیژنەیـەکی دادوەریـەوە بگـەڕێن بەشوێن بەها مرۆییەکاندا لە هـەر کولتورێکـدا، بـەڵکو ئـەم بـوارەش تێکـەڵ کراوە بە ئاستی باڵانسی هێزەکان لە جیهاندا. ئەو هێزەش ئابوری بێت یـان سیاســی یــان ســەربازی. لــەم بارەیــەوە (بارکــەر) دەڵێــت هــەژموونی ئەوروپییــەکان بەســەر جیهانــدا بەشــێوەیەکی ســەرەکی دەگەڕێتــەوە بــۆ بەکارهێنانی هێز بەشێوەیەکی بەردەوام، ئەم هەژموونەشـیان تـەنها بـەهۆی پێـشکەوتنیانە لــە بـواری ســەربازیداو ناگەڕێتــەوە بـۆ هـیچ بـوارێکی تـری ئەخلاقی سروشتی[٩٦].

---

[٩٥] العولمة والتحولات المجتمعية،ل١٥٠

[٩٦] نعوم تشومسكي: ٥٠١ سنة الغزو مستمر،ترجمة: حي النبهات،دار المدى للثقافة والنــشر، دمــشق، چ١، ١٩٩٦ ، ل٢٤

نەخوێندنــەوەی بەرامبــەرەکانو گــوێ نــەگرتن بۆیــانو خوێندنــەوەی کولتوری خود وەك کولتــوری بــاڵا، بــە درێــژایی چــاخە یــەك بــەدوا یەکــەکان بریتی بــووە لــە ئــەخلاقی پیــاوی ســپی، لەبەرئــەوە لــە هــەر سەدەیەکیــشدا دەبینین لەژێر دروشمو ناوێکی تایبەتیدا تەعبیر لە خۆی دەکات.

(حەسەن حەنەفی) دەڵێت: "رۆژئاوا بەردەوام شێوازی نوێ لە هەژموون دادەهێنێت، ئەویش لە رێگەی بەرهەمهێنانی چەمکی نــوێو رواندنیــەتی لــە دەرەوەی سنورەکانی خۆیدا، وەك بەجیهانیبوون، کۆتایی مێژوو، ململانێــی شارســتانیەکان، بــەڕێوەبردنی بــاڵا، ئــەم چــەمکانە لــە مێــژووی جیهــانی هاوچەرخدا تەعبیر دەکەن لەسەر ئاشکرابوونی دەست بەسەرداگرتنی ناوەند بەسەر کەنارەکاندا"[٩٧]

ئاستی گەشەی کولتوری رۆژئاوایی جیاوازە لە قۆناغو پێکهاتەو گەشــەی کولتورە نارۆژئاواییەکان. لەبەرئەوە کاتێك کە رۆژئاوا دەیەوێت کولتورەکەی بکات بە کولتورێکی جیهانی، دەبینین جۆرێك لە کاردانەوە لەناو خودی ئــەم کولتورانــەدا دروســت دەبێــتو ئــەوانیش لــە بەرامبــەردا لــەپێناو مانــەوەو نەتوانەوەو خۆراگرتندا بە جۆرێکی تر خۆیان رێك دەخەنەوە.

ئەوەی ئەمڕۆ لە جیهاندا دەبینرێت، هەوڵی کولتورە لۆکاڵیەکانــە بــۆ خــۆ رێکخــستنەوەو بەرهــەمهێنانی کولتــورێکی نــوێ نــەك توانــەوە لــە کولتــورە رۆژئاواییەکەدا، ئەگەر ئێمە لە روکەشدا وابزانین کولتوری رۆژئاوایی لە جلو بەرگو مۆدێلو بازاڕدا توانیویەتی وێنەیەکی روکەشی بازاڕی بۆخۆی دروست بکات، بەڵام سایکۆلۆژیای تاکەکان بەوجۆرە نییەو زۆرجار ئەنتی کولتورێکی رۆژئــاوایی تیایانــدا دروســت بــووەو زۆر نــاڕازین بــەو بارودۆخــە نوێیــەی کــە

---

[٩٧] د.محمد حسين أبو العلا:ديكتاتورية العولمة، سەچاوەی پێشوو، ل١٦٩

دروست بووه، چونكه وا دەزانن ئەو كولتورە نامۆیە بەشوناس‌و شارستانیەت‌و كولتوری نەتەوەیی‌و دواجار بۆ پاراستنی دەبێت پێداگیری بكرێت.

محمد عابد جابری دەڵێت: رۆژئاوا تەنها لە روكەشدا چۆتە ناوەوەی جیهان، ئەویش تەنها لە ئاستەكانی شمەك‌و بابەت یان ئەگەر زۆر قوڵتر رۆبچین لەسەر ئاستی بەهاكان، چەمكە رۆژئاواییەكان جیاوازیەكی بنەڕەتیان هەیە وەك لەوەی لە شارستانیەتەكانی تردا هەیە، لەبەرئەوە ئەگەر سەیر بكەین ئەوەی پەیوەندی بە تاك گەرایی‌و لیبرالیەت‌و سیستمی دەستوری‌و مافەكانی مرۆڤ‌و دیموكراسی.. هتد هەیە زۆر بەباشی لەلایەن شارستانیەتەكانی ترەوە وەرناگیرێت[٩٨].

ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت كە گەلانی نارۆژئاوایی نەیانەوێت لەو بوارانەدا بەرەوپێش بچن، بەڵكو لەبەرئەوەیە كە ئەو چەمكانە بە جیهانبینی‌و كولتوری رۆژئاوایی گرفتیان بۆ دروست دەكات لە نەسیجی كۆمەڵایەتیدا. لەبەرئەوە ئەوان دەیانەوێت شوناسێكی نوێ بەئەو چەمكانە ببەخشن بۆ نموونە هەر ئەو چەمكانە لە وڵاتانی ئیسلامیدا هەوڵ دەدرێت كە بە پشت بەستن بە كولتورو شارستانیەتی ئیسلامی جارێكی تر دابڕێژرێنەوە، بۆئەوەی لەلایەن هاوڵاتیانی سادەو شەقامەوە ئاسانتر ملكەچی ببن‌و تێی بگەن.

ئەمریكا پاش ئەوەی سەركەوتنی بەدەست هێنا لە جەنگی ساردا، نابینیت كەس باس لە بوونی هیچ كولتورێكی تر بكات لەپاڵ كولتورەكەی خۆیدا، بەڵكو لەم كاتەدا فۆكۆیاما تیۆرە نوێیەكەی خۆی بڵاو دەكاتەوە

---

[٩٨] د.محمد عابد الجابري:قضايا في الفكر المعاصر،مصدر سابق،ل١٢١-١٢٢

بەناوی (کۆتایی مێـژوو)، ئەمـەش لـە وەزارەتـی دەرەوەو بـەرگری‌و لەسـەر ئاستی ئەنجوومەنی ئاسایـشی نەتـەوەیش دەبێتـە نەخـشەرێگای کـارکردن‌و لەم رێگەیەشەوە کولتوری لیبرالّی ئەمریکا دەکەنە تاکە کولتوری بالاّدەسـت لــە جیهانــداو دەبێــت هــەموو کولتورەکــانی تــر ملکەچــی بــن. نووســەری بەناوبانگی ئەمریکی (تۆماس فریـدمان) دەڵێـت: بـەجیهانیبوونی کولتـوری، گشتگیرو خێراو فراوانەو بنەماکانی خۆی فەرز دەکات بەسەر هەموو لایەکدا، بـەبێ ئـەوەی بـواری ئـازادی هەڵبـژاردنیان پـێ بـدات. ئەمـەش بـە فراوانـی سـنوری ١٩٥ دەوڵـەت ئـەنجام دەدات. بەمــەش شارســتانیەتێکی جیهـانی یـەکگرتووی دروسـت کـردووە، ئـەویش بـە دروسـتکردنی کۆمـەڵێك بنـەمای بەیەکداچـوو. کـە بارودۆخـە تایبەتیـەکانی پـشت گـوێ خـستووە لـە هـەر دەوڵەت‌و کۆمەڵگەیەکـدا بێـت، بەمـەش شوناسـی کولتـوری‌و شارسـتانیەتی گەلانی لەبیر خۆی بردۆتەوە[٩٩].

رۆژئـاوا لــەرووی کولتوریــەوە بـڕوای بــە گفتوگـۆو لەیــەکتر گەیـشتن‌و ئەنجامدانی توێژینەوە نییە، بۆئەوەی بگەنە بەهایـەکی مرۆیـی هاوبـەش لـە نێوان هەموو کولتورەکاندا لەسەر بنەمایەکی جیهانی، بەڵکو هەموو گفتوگۆو مـشتومڕو مێزگـردو کۆڕەکانیـان بۆئەوەیـە کـە پێمـان بڵـێن، ئێمـە خـاوەن کولتورێکی بالاّی جیهانین، هیچ کولتورێکی تر ناتوانێت خۆی بدات لەشانی، کولتورێکی مرۆیی پێگەیـشتووە دەتوانێـت ببێتـە کولتـوری هـەموو گـەلان، بەردەوام لەگەشەو بەرەوپێش چـووندایە هـیچ ئاڵۆزیـەکی تیـادا نییـە، مـرۆڤ بەختــەوەر دەکـات‌و ژیـانێکی پـڕ لـە رەفاهیـەت‌و خۆشـگوزەرانی بـۆ دابـین دەکات، لـە بەرامبەریـشدا هـیچ کولتورێك نییـە کـە خـاوەنی ئـەم سـیفەت‌و

---

[٩٩] جیهان سلیم: عولمة الثقافة و استراتیجیات التعامل معها، **سەرچاوەی پێشوو**،

جوانیانە بێت. لەبەرئەوەی کە هەموو سیفەتە جوانەکانیش لە ئەم کولتورەدا کۆبوونــەوە ئەگــەر باسیــشی نەکــەن مانــای وایــە بەرامبــەرەکان خــاوەنی کولتورێکی وانین کە ئەم سیفەتانەی تیادا بێـت، کەواتــە شـایەنی ئــەوە نــین لــەم ســەردەمی بەجیهانیبوونــەدا خۆیــان نمــایش بکــەنو داوای مانــەوەو گەشەپێدان بکەن، بەڵکو کولتورە رۆژئاوایەکە هــەموو ئەوانــەی تێپەڕانـدووە کەواتە شایەنی ئەوەیە ببێتە کولتورێکی جیهانی.

بــەجیهانیبوون دەیــەوێت بەشـێوەیەکی ئاسـایی بۆچـوونەکانی رۆژئــاواو دیدە ئایدۆلۆژیو کولتوریەکانی لەلایەن گەلانی ترەوە قبوڵ بکرێت، بۆ ئــەم مەبەستەش پشت دەبەستێت بە کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکانو دامەزراوە میدیاییە نێودەوڵەتییــەکانو ئاژانــسەکانی هـــەواڵی جیهـــانی ئـــەویش لـــەپێناو بڵاوکردنـــەوەی کولتـــوری بـــەجیهانیبوونو گـــشتگیر کردنـــی نموونـــەی سەرمایەداری، ئەویش بۆئەوەی شوناسی رۆژئاوا بکات بـە شوناسـی هــەموو گەلانی جیهان[100].

بەجیهانی کردنی کولتور جەخت دەکاتەوە لەسەر سەنتەریەتی کولتـوری رۆژئاوایی، بەڵام بەشێوەیەکی نوێو بە پشت بەستن بە ئالیەتی تەکنۆلۆژیو تۆڕەکانی پەیوەندیو کەرەستەکانی میدیای نوێ.

حەسەن حەنەفی دەڵێت: بەجیهانیبوون تەعبیر لە سەنتەریەتێکی شاراوە دەکــات لــە کۆنەســتی ئەوروپیــدا، لەســەر بنــەمای رەگــەز پەرســتیەکی سەرتاپاگیر بەشێوەی ئاسۆیی دامەزراوە، کە لە هەوڵی دەست بەسەراگرتنو هەژمووندایە، لای ئەو سپی باشترە لە رەشو سەوزو سورو ئەسمەر، هیندیە

---

[100] حسن لطيف، كاظم الزبيدي :العولمة ومستقبل الدور الإقتصادي للدولة في العـــالم الثالـــث، دار الكتـــاب الجامعي،الإمارات ، چ١،٢٠٠٢ل١٩٨.

ســورەکانی ریــشەکێش کــرد لــە ئــەمریکاو ئوســترالیا، ئەفریقیــە رەش پێستەکانی پەرتەوازە کردو لە سەرەتای سەدەکانی نوێدا کەوتە راوکردنیان وەك ئاژەڵو بەکاری هێنان بۆ بنیاتنـانی کیـشوەرە نوێیەکـە، دەسـتی دایـە داگیرکردنی جیهانی عەرەبیو ئیسلامی کە ئەسمەر بـوون، یەکـەمین بـۆمبی ئەتۆمی کێشا بە رەگەزی زەرددا لە هێرۆشیماو ناکازاکیدا[١٠١].

بەم شێوەیە کودەتایـەکی ریـشەیی رویـدا لەسـەر دەسـتی ئەوروپیـەکان بەسەر ژیانی گەلانی جیهاندا، لە ئێستاوە بەجۆرێك سـەیری ئاینـدە دەکـەن کە شـتێکەو بەدەسـتی مرۆڤـە، لەبەرئـەوە ئـەوانیش دەیانـەوێت بـە هـەموو شێوەیەك کۆنترۆڵی ژیانی مرۆڤەکانی سەرزەوی بکەنو لە ئێستاشدا ئەمە لە رێگەی بەجیهانیبوونەوە دەکەن.

هەندێك لە فەیلەسوفـو روناکبیرانی رۆژئـاوا لـە ئێـستادا دەیانـەوێت ئـەو پێشکەوتنە جیهانیەی کە ئێستا لە ئارادایە، پەیوەست بکەنەوە بە بزاڤێکـی مێژوویی رابردووەوە، چەقی ئەو گۆڕانکاریەش لـە رۆژئـاواو یۆنـانو رۆمانـەوە وەردەگرنو بەجۆرێك لە جۆرەکان سەنتەریەتی رۆژئاوا دەکەنەوە بە بەشێك لە کولتوری پاپاکان لە رۆژئاوادا.

لەبەرئەوە دەیانەوێت هەموو دەسـتکەوتەکانی فیکـرو مێـژوو فەلـسەفەو مەدەنیەتو شارستانیەت لەجیهاندا هەیە بڕژێتە ناو روباری گەورەی رۆژئاواو مێژووە پڕشنگدارەکەی[١٠٢].

---

[١٠١] د.حسن حنفي،د.جلال العظم:ماالعولمة، **سەرچاوەی پێشوو**، ل٤٦

[١٠٢] د.محمد عابد الجابري:مسألة الهوية،العروبة والإسلام..والغرب، مركز دراسات وحــدة العربيــة،،بيروت ط١٩٩٧،٢،ص١٢١

له رۆژئاوادا هۆشیاری تاك لەسەر ناسینی بەرامبەرەكان دادەڕێژرێت، چونكە وا دەزانن دروستكردنی (من)ی رۆژئاوایی ناتەواو كرچو كاڵە ئەگەر شتێكی تری لەگەڵدا نەبێت، كە ئەویش پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی (ئەویتره) كە پێویستە پەراوێز بخرێتو ناشیرین بكرێتو تەنها بكرێتە بابەتێك بۆ لێدوان. ئەمەش ئەو ئەركە گرنگە بوو كە "رۆژهەلاتناسی" پێ هەڵسا، رۆژئاوا زۆر پێویستی بەم كارە هەبوو، چونكە دەیویست لە رێگەی ناسینی رۆژهەلاتەوە كە توانیان جیای بكەنەوەو پێناسێكی بۆ دابنێن، لە بەرامبەردا ژێرخانی ئەوی رۆژئاوایی لەسەر بنیات بنێنو بۆئەوەی وەك تاكێكی سەربەخۆ بناسرێتو لەدوای ئەوەش ئەو ببێتە بابەتێك بۆ لێدوان لەسەری[(١٠٣)].

لەسەر ئاستێكی بەرزی فەلسەفیو ئەكادیمی رۆژئاواییەكان بڕوایان وایە كە مرۆڤی نارۆژئاوایی مرۆڤێكی ناكارایەو لە مێژووشدا نەیتوانیوە شارستانیەت بەرهەم بهێنێت، لەبەرئەوە ئەوان بڕوایان بە بوونی عەقڵو شارستانیەت نییە لە دەرەوەی جوگرافیاو مێژووی رۆژئاوا.

(دكتۆر عەلی قەرەداغی) لەم بارەیەوە دەڵێت: "زۆرینەی فەیلەسوفو سیاسییەكانی رۆژئاوا لەو بڕوایەدان كە شارستانیەتەكەیان بەهێزترینو باشترینە بۆ مانەوە، لەبەرئەوە پێویستە خاوەن شارستانیەتەكانی تر ملكەچی ئەم شارستانیە رۆژئاواییەو بەهاكانی بن، بۆئەوەی بەخۆشی بژینو بەهێز بن"[(١٠٤)]

---

[(١٠٣)] هەمان سەرچاوە،ل١٢٧-١٢٨

[(١٠٤)] أ.د.علي محي الدين القرة داغي:نحن والآخر،، مؤسسة بانكي حق للنشر،سليمانية، چ٢٠٠٦،٢، ل٦٢

(راشـــيد غەننووشـــی) دەڵێــت: "دیــدو تێڕوانینـــی ڕۆژئـــاوا بـــۆ مـــرۆڤو مەدەنیەتو مۆدێرنیزم، بریتیە لە جۆرە بۆچوونێك كە ڕێگە خۆش دەكەن بۆ پەیداكردنی هەژموون بەسەر بەرامبەرەكانو سەروەتو سامانیان، ئەویش بە بەكارهێنانی جەنگی كوشندە" بۆ ئەم مەبەستەش ئاوڕێك بەلای بەهاو نرخی مرۆڤدا نادەنەوە. بەڵكو هەموو ئەو شتانەی تەنها بـۆ هـاوڵاتی ڕۆژئـاوایی بـە ماف دەزانن[١٠٥].

ڕۆژئاواییەكان پێش ئەوەی دەست بدەنە داگیركـاری وڵاتـانی ڕۆژهــەڵات. هەستان بە دروستكردنی چـەندان تیمـی زانـستی بـۆ دەسـتكەوتنی زانیـاری لەسەر جوگرافیاو دانیـشتوانو ئـاینو كولتـورو سیاسـەتی ئـەم گەلانـە، لـەم ڕێگەیەوە كاریان لەسەر كولتـوری ئـەم گەلانـە كـردووە، بۆئـەوەی ژینگـەی كولتوریان تێك بدەنو كولتوری ڕۆژئاوایی لە جێگەكەیدا بـچێنن، لەبەرئـەوە دەبینین كە هەڵوێستو مامەڵەیان لە ئاسـت گەلـە داگیركراوەكانـدا بـە لـوت بەرزی و خۆ بە زلزانیو بە سوك سەیركردنی بەرامبەرەكان بووەو كە لـە زۆر شـــوێندا تەنانـــەت وەك مـــرۆڤیش ســـەیریان ناكـــەنو مامەڵەیـــەكی زۆر نامرۆڤانەیان لەگەڵدا دەكەن.

ڕۆژهـەڵات ناسـەكان زۆر بـە عەقڵیـەتێكی پـڕ لـە بـوغزو پـلان گێڕیـەوە مامەڵەیان لەگەڵ گەلە ڕۆژهەڵاتیەكاندا كردووە، لـەم ڕێگەیـەوە دەیانویـست لەلایەك كولتوری ڕۆژهـەڵات لەبەرچـاوی گەلـەكانیان سـوك بكـەن، لەلایـەكی ترەوە ڕێگە خۆش بكەن بۆ كولتوری ڕۆژئـاوایی كـە جێگـەی بگرێتـەوە، لـە دیدی ڕۆژهەڵات ناسەكانەوە عەقڵیـەتو كولتـورو شارسـتانیەتی ئـەم گەلانـە هەمووی وەك یەك وایە. هەموویان (دواكەوتوو، نەفام، بەربەری، توندڕەو)ن،

---

[١٠٥] راشد الغنوشي :مقاربات في العلمانية والمجتمع المدني، المركز المغاربي، بيروت، ١٩٩٩،ل٩٨

ئەمانە هەرگیز بۆخۆیان ناتوانن رزگاریان ببێت لـەم بارودۆخـە، بەبۆچـوونی ئەوان بنەمای ئەم قەیرانو نەهامەتیانـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئاینەکـەیان کـە ئیسلامە، چونکە ئیسلام سیستمێکی دواکـەوتووەو کولتـوری دواکـەوتوویی‌و ستەمکاری‌و توندڕەوی بەرهەم دەهێنێت، ئیسلام عەقڵیـەتی مـسوڵمانەکانی گۆڕیـوە بـۆ جادوگـەری‌و نـا عەقلانیـەت، لەبەرئـەوە رۆژهـەڵات رۆژهەڵاتـەو ئیسلامیش ئیسلامە.

ئەگەر سـەیری ئـەو توێژینەوانـە بکـەین کـە نووسـیویانە، مەبەسـت لێـی ناسـینی ژینگـەو شارسـتانیەت‌و کولتـوری ئـەم گەلانـە نییـە بەشـێوەیەکی زانستی، چونکە ئەوان بە شوێن زانینی راستیەکان نـین وەك خـۆی، بـۆ ئـەم مەبەستە ئەوان ناچـن توێژینـەوە لەسـەر مێـژوو شارسـتانیەتی راسـتی ئـەم گەلانە بکەن، چونکە ئەوان بەشێوەی پلانێکـی نەخـشە بـۆ کێشراو هـەنگاو هەڵدەگرن‌و پێـشتر بڕیارەکانیـان داوە چـی بڵـێن، چـونکە ئـەوان بـە نیـازی داگیرکاری قسەیان کردووەو پلانی ئەوەیان هـەبووە کـە باڵادەسـتی رۆژئـاوا لەرووی کولتورو سیاسەت‌و ئابوری بسەلمێنن، سـەرەڕای ئـەوەی کـە بـواری پسپۆڕی رۆژهەڵات ناسەکان جیاواز بووە.

بەڵام هەموویان بە لوت بەرزیەوە سەیری خۆیان دەکەن‌و بەچاوێکی سوك رۆژهەڵات دەبیـنن‌و بـە نهێنـیش داوای گاڵتـەجاری دەکـەن پێـی، رۆژهـەڵات ناسەکان بەردەوام بە چاوێکی کەمییەوە سەیری رۆژهەڵات دەکەن، ئەمـەش جەوهـەری کـاری رۆژهـەڵات ناسـیە کـە دەبێـت رۆژئـاوا لـە بـەرزی دا بێـت‌و رۆژهەڵاتیش لە نزمیدا[١٠٦].

---

[١٠٦] د.نديم البيطار:حدود الهوية القومية،نقد عام، بيسان للنشر والتوزيع والأعلام،بيروت،،چ٢، ٢٠٠٢م، ل١١٧

ڕۆژهەڵات ناسەکان وێنەیەکی تایبەتیان بۆ ڕۆژهەڵات دروست کردووە، بە بڕوای ئەوان دانیشتوانی ئەم ناوچەیە، مرۆڤی داماو و ناتەواو و بەربەریو نەفامن، لەبەرئەوە پێویستیان بە هاوکاریو بەزەیی هەیە، لە ئێستاشدا ئەو مرۆڤە بە بەزەییە پێشکەوتوخوازە مرۆڤی ڕۆژئاواییە، بەجۆرەها شێوازە هۆکار دەیەوێت ئەم مرۆڤە رزگار بکاتو گەشەی پێ بداتو بیهێنێتە ئاستی مرۆڤو ژیانێکی مرۆڤانەی شایستە، چونکە بەپێی ئەو وێنەیەکی کە ڕۆژهەڵات ناسەکان بۆ مرۆڤی ڕۆژهەڵاتیان دروست کردووە مرۆڤێکی (گەمژەو ناعەقڵانیو ناتەواوەو توانای تێگەیشتنی لە واقیع نییە). مرۆڤێکی ڕۆحانیو خێڵەکییەو توانای بە واقیعی بوونو شیکاری نییە، لە شارستانیەتێکی نامۆو بارودۆخێکی ئەفسانەییدا دەژی کە ژینگەی جنۆکەیە[١٠٧]. ڕۆژهەڵاتیەکان خاوەنی عەقڵێکی نزمترن لە عەقڵی ڕۆژئاواییەکان، لەم بارەیەوە (کرۆمەر) دەڵێت: "ڕۆژئاواییەکان خاوەنی عەقڵیەتێکی دادوەری وردن، ڕێز لە راستیەکان دەگرن، مرۆڤێکی عەقڵانیە، بەڵام عەقڵی ڕۆژهەڵات بە پێچەوانەی ئەمەوەیە"[١٠٨]

تێڕوانینی ڕۆژهەڵات ناسەکان زۆرجار بە باکگراوندێکی ئایینیو ڕۆحێکی مێژووییەوە( وەك مەسیحیەك) خوێندنەوە بۆ مسوڵمانەکان دەکەن، دەگەڕێنەوە بۆ مێژوو، لەوێوە هەڵوێستەکانیان دیاری دەکەن، لەبەرئەوەی کە وەك دوژمنێك وێنای مسوڵمانەکان بکەن. چاویان هیچ راستیو جوانیو شارستانیەتێك نابینێت، وەك بەرامبەرێکی شارستانی خوێندنەوەیان بۆ ناکەن، بەڵکو وەك دوژمنێکی ڕۆژئاوا دەیانناسێنن، هەتا هاوڵاتیانی

---

(١٠٧) إبراهيم الحيدري:صورة الشرق في عيون الغرب،بيروت،دارالساقي،چ٢، ١٩٨٦،ل٣٨

(١٠٨) د.محمد عابد الجابري:مسألة الهوية، **سەرچاوەی پێشوو**، ل١٣٠

ڕۆژئاوایی بەوشێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەنو لە ئەم ڕێگەیەشەوە ڕێگە لە یەکتر ناسینو پەیڤینو توێژینەوەی زانستی دەگرن.

ئەدیبی فەڕەنسی (شاتو بریان) دەڵێت: "جەنگەکانی خاچ پەرستی تەنها لەپێناو ڕزگارکردنی کەنیسەی قیامەدا نەبوو، بەڵکو بۆ ئەوەبوو بزانرێت کە کێ فەرمانڕەوایی زەوی بەدەستەوە دەگرێت، ئایا سەرکەوتن دەبێتە شانسی ئەو ئاینەی کە پێی دەڵێن ئیسلام، کە بەردەوام ڕێز لە نەفامیو ستەمکاریو کۆیلایەتی دەگرێت، یان ئەو ئاینە سەردەکەوێت کە کار دەکات لەپێناو هۆشیارکردنەوەو گێڕانەوەی دانایی بۆ مرۆڤو کۆتایی هێنان بە کۆیلایەتیو بڵاوکردنەوەی ئازادی" لە شوێنێکی تردا دەڵێت: "مێژووی ڕۆژهەڵاتیەکان بێجگە لە ستەمکاری هیچ شتێکی تر نازانێت، هەموو سەدە بەناوبانگەکانی ئەوان سەدەی ستەمکاریو دەسەڵاتی ڕەها بووە"[(١٠٩)]

ڕۆژئاوا وای نابینێت کە هیچ ئاینێك هەبێت خۆی بدات لە شانی ئایینی مەسیحی، هەرچەند پێشکەوتوترو لێبوردەو تەواویش بێت، لە هەموو بارێکدا ئەوان ئیسلام بە وێنەیەکی درۆزنەی مەسیحی دەزانن، ڕۆژهەڵاتناسیش دێتو هەرچی لە عەقڵو فیکرو کولتورەکەیدا هەیە هەمووی بەسەر ئایینی ئیسلامدا دەڕێژێت[(١١٠)].

بەشێوەیەکی پراکتیکیش دەتوانین ڕاستی ئەم بۆچوونە بسەلمێنین ئەویش لە دووتیۆری یەك بەدوایەکدا، کە لەدوایەوە عەقلێکی ڕۆژئاوایی هەیە بە سەرۆکایەتی ئەمریکا .

---

(١٠٩) سەچاوەی پێشوو، ل ١٣١

(١١٠) أنور محمد فرج :المركزية الغربية، من التمركز حول الذات إلى الهيمنة على الآخر، رسالة ماجستير، جامعة النيلين، خرطوم، قسم العلوم السياسية، ٢٠٠٣،ل٦٢

## یەکەم: کۆتایی مێژوو یان کۆتایی کولتورەکان

لــە دوای کۆتــایی هــاتنی جــەنگی ســارد، لەناوەنــدە ســتراتیجیەکانو ناوەنـدەکانی توێژینــەوەو لێکۆڵینــەوەی رۆژئـاواو ئـەمریکاداو بەتایبــەتیش لەلایــەن نوخبــەی سیاســیو کولتوریــەوە، کۆمــەڵێك تیــۆرو توێژینــەوەی فیکریو سیاسی خرایەڕوو، بەتایبەتیش لە پاش رووخانی یەکێتی سۆڤیەتو هەرەسـی دیـواری بـەرلینو کۆتـایی شـەڕی سـارد، کـە نزیکـەی نیـو سـەدە درێژەی کێشاو ملیۆنان مرۆڤ تیایدا بوونە قوربانی. لە کۆتاییدا شەڕی سـارد کۆتایی هاتو یەکێتی سۆڤیەتو هاوپەیمانەکانی هەرەسیان کرد کە لەلایـەن رۆژئاواییەکانەوە ناودەبران بە بەرەی (شەڕ)، ئـەم هـەرەس هێنانـە لەلایـەن ناوەندو سەنتەرە ستراتیجیەکانەوە قۆسترایەوەو بە سەرکەوتنی جیهانبینیو فەلسەفەی رۆژئاوا لە قەڵەمیاندا. ئەم سەرکەوتنە لەلایەن فۆکۆیاماوە نـاوبرا بە کۆتایی مێژوو بۆ کۆی مرۆڤایەتی. بیرۆکەی کۆتایی مێژوو، بەرهەمی ئـەو بارودۆخە سیاسییە بوو کـە لـەو سـەردەمەدا سـەری هەڵـدا، لەبەرئـەوە ئـەم تیۆرە ئەوەندەی پەیوەستە بە بارودۆخێکی سیاسیی تایبەتیـەوە، ئەوەنـدە بەیوەست نییە بە جیهانبینیو فەلسەفەیەکی فیکـری قوڵـەوە، چـونکە ئـەم تیـۆرە راسـتەوخۆ پەیوەسـتە بـە ناوەنـدە سیاسـییەکان، بەتایبـەتیش ئـەو بارودۆخەی کە لە دوای جەنگی سارد هاتـە ئـاراو (جـۆرج بـۆش)ی سـەرۆکی ئەمریکا دەستی کرد بە جوڵاندنی هێز بۆ دەرەوەی سنورەکانی خۆی.

روداوی ساڵەکانی نەوەد بارودخێکی جیهانی نوێی هێنایە ئاراوە، کە تیایدا وڵاتانی رۆژهەڵات هەرەسیان کرد، یەکێتی سۆڤیەت هەڵوەشا، لە ساڵی ١٩٨٩دا دیواری بەرلین روخا، پاشان روسیا ناچاربوو کە ژمارەیەك رێکەوتننامە لەگەڵ ئەمریکادا مۆر بکات. بەمەش بە تەواوی دۆسیەی یەکێك لە وڵاتە زلهێزەکانی دنیا پێچرایەوەو بە تەواوی لەروی سیاسییو ئابوریو سەربازیەوە ئیفلاسی کردو هەر بەم هۆیەشەوە بوە پاشکۆی ئەمریکا. تیۆریسینە ئەمریکیەکان هاتنو ئەمەیان بە سەرکەوتنی لیبرالیزمو سەرمایەداری لە قەڵەم دا، لەم سەرودەمەدا سیستمی نوێی جیهانی هاتوو لەسەر ئەو دیدو بۆچوونانە خۆی نمایش کردو بوە پاڵپشتێکی گەورە بۆ بۆچوونەکانی فۆکۆیاماو هەر لێرەوە ئەم بۆچوونە لە وتارێکەوە بوە کتێبێكو پاشان بوە تیۆرێکی کاری سیاسیی لە وەزارەتی بەرگریو دەرەوەی ئەمریکا.

ئەو وتارەی کە فۆکۆیاما لە کۆتایی هەشتاکانداو لە هاوینی ١٩٨٩ لە گۆڤاری ( The national interest ) بڵاوی کردەوە جیهانی تووشی سەرسوڕمان کرد، لە دەرەوەی ئەمریکاو رۆژئاواشدا چەندان کتێبو وتارو لێدوانی جۆربەجۆری لە بارەوە دراو گفتوگۆی زۆری لەسەر کرا.

لەدوای گفتوگۆو مشتومڕێکی درێژو زۆری بیروڕای جیاواز لەسەر ئەم وتارە، ئەمە بوە هۆی ئەوەی کە نووسەرەکەی بیر بکاتەوە کە درێژە بە نوسینەکەی بداتو بیکات بە کتێبێك بەناوی (کۆتایی مێژوو دوایەمین مرۆڤ The end of history and the last man –)، لە راستیدا ئەم کتێبە تەعبیر لە جەوهەری دیدو بۆچوونەکانی رۆژئاوا دەکات بەرامبەر بە

ژیانو جیهانبینیو تێڕوانینی بۆ مێژوو فیکرو کولتوری ئەوانی تـرو، ئـەوەش کە لە داهاتوودا روو دەدات.

پاڵنەری سەرەکی فۆکۆیاماله نوسینی ئەم تیۆرەدا، پاڵنەرێکی سیاسـیی بوو، فۆکۆیاما روناکبیرێکی سـتراتیجی بـوو، لەگـەڵ دامـەزراوەی (رانـد) بـۆ توێژینەوە کـاری دەکـرد کـە نزیـك بـوو لـە فەرمانگـەی وەزارەتـی دەرەوەو بـەرگری ئـەمریکا، لەوکاتـەدا کـە وتارەکـەی بڵاوبـوەوە گواسـترایەوە بـۆ وەزارەتی دەرەوە.

فۆکۆیامـا لـە دوای بڵاوبوونـەوەی کتێبەکـەی لـە سـاڵی ١٩٩٢ دا لەگـەڵ ئاژانسی هـەواڵی (ئۆرنیـت پـرێس) وتـی: "ئێمـە وەك ئـەمریکا گـەورەترین سـەرکەوتنمان بەدەسـت هێنـا لـە کۆتـایی سـەدەی بیـست لـە لـەناوبردنی شیوعیەت و روخانی دەوڵەتی عێراق، لەبەرئەوە ئێستا کەس گومانی لـەوەدا نییـــە کـــە ئـــەمریکا رابـــەری جیهانـــە، ئێمـــەش ئێـــستا گـــەورەترینو بەهێزترینین"[111]

ئەم کتێبە پەیامەکەی ئاشکرایە، تەعبیر لە شوناسێکی ئەمریکی دەکات، کە وای لەقەڵەم دەدات جیهانی خستۆتە ژێر هەژموونی خۆی، بەشێك لەوەی کە رەواجی بە ئەم کتێبە پەیـداکردو ناوبـانگێکی جیهـانی بـۆ دروسـت بـوو، ئـــەوەبوو کـــە پـــشتیوانی کـــردن بـــوو لـــە سیاســـەتەکانی ئـــەمریکاو هەوڵـــە فراوانخوازیـەکانی لـە جیهانـدا. فۆکۆیامـا لـەبارودۆخێکی سیاسـیی جیهـانی تایبەتمەنـددا، هــات فیکــری کــردە قوربــانی سیاســەتو روخــانی کوتلــەی رۆژهەڵاتی کردە هۆکارێك بۆ سەرکەوتنی لیبرالیـزمو بـازاڕی ئـازادو رۆژئـاوا، فۆکۆیاما نایەوێت باس لە قەیرانەکانی سەرمایەداریو لیبرالیزمو کێشەکانی

[111] فرانسيس فوكوياما:نهاية التأريخ و الأنسان ألأخير"ترجمة:د.حسن الشيخ:دار العلوم،بيروت، ١٩٩٢)ل٧

کۆمەڵگەی رۆژئـاوایی بکـات، کـە بـەهۆی سیاسـەتەکانی ئـەمریکا تووشـیان بووە. بە پێچەوانەی ئەوەوە دێتو لیبرالیزم دەکاتە نمونەیەکی مێژوویی بـۆ گەلانی جیهان. بەجۆرێك پیرۆزی پـێ دەدات وەك کۆتـا ئـاین دەیخاتـە روو، وەك رزگارکەرو مژدەدەر ناوی دەبـاتو، دەیکاتـە نموونـە بـۆ دروسـتکردنی کۆتا مرۆڤ لە جیهاندا.

لەپێش فۆکۆیامادا چەندان روناکبیرو سیاسەتمەداری تری وەك (ریتـشارد نیکسون) هەبوون کە لەپێش فۆکۆیامادا باسیان لە ستراتیجیەتو سیاسەتی ئـەمریکا کـردووە لـە جیهـانی هاوچـەرخ دا، نیکـسۆن لـەو بڕوایـەدابوو، کـە روخانی یەکێتی سـۆڤیەت هـەلێکی زێـڕین بـوو بـۆ ئـەمریکاو لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: لـە دوای روداوە گەرمـەکانی ١٨٩٩، ١٩٩٠، ١٩٩١ کـاتێکی گونجـاو هاتە پێش، بۆئەوەی ئەمریکا جارێکی تر ئاراستەی جیۆ سیاسییەکانی خۆی دابڕێژێتەوە، لـە ئێـستادا هـەلێکی بـاش لـە بەردەممانـدا هەیـە بـۆ گـۆڕینی جیهـان.. پێویـستە ئەولـەویاتی ئێمـە لـە ئێـستادا دەربـارەی سـەرلەنوێ داڕشتنەوەی سیاسەتی ئەمریکاو بنیاتنانی ستراتیجیەتێکی نوێ بێت[١١٢].

لەدوای ئەوەی کە ئەمریکا بە تەنها دەستی گـرت بەسـەر جیهانـدا، ئـیتر گیانی شکست لەناو گەلانی نـا رۆژئاواییـدا بڵاوبـووەوەو لـەو بڕوایەشـدابوون ئەمە کۆتایی مێژوە، دیموکراتیەتی رۆژئاوایش تەنها سیستمێکە بۆ ژیان، لـە ئاسـت ئـەم سـەرکەوتنەی رۆژئاواشـدا، مێـژوو دەوەسـتێتو بـۆ دواجـار

[١١٢] ریتشارد نیکسون:امریکا والفرصة السانحة،ترجمة محمـد زکریـا اسـماعیل،، مکتبـة بیـسان،بیروت، ١٩٩٢م،ل٣٤

لیبرالیزمی ئەمریکا سەردەکەوێت، لەم بارودۆخەدا فۆکۆیاما پێشنیاری کۆتایی مێژوو کۆتایی مرۆڤی کرد[١١٣].

تیۆرەکەی ئەمریکا زۆرتر تیۆرێکی ئابوریە، چونکە ئەو مرۆڤە کۆتایەی کە ئەو باسی دەکات، مرۆڤێکی بەکاربەرە، بەشوێن خۆشیدا دەگەرێت، ئامادەی قوربانیدان نییە بۆ ئایینو نیشتمانو نەتەوە، بەپێی ئەم تێروانینەش ئەمریکا وەك تاکە هێزێکی ئابوری گەورە لە رێگەی کۆمپانیاکانیەوە دەتوانێت دەست بەسەر ئابوری جیهاندا بگرێت.

ئێمە دەمانەوێت جیهان بکەینە بازارێکی گەورە (سۆپەرمارکێت)، کە هەموو شتێکی تێدا بێت، ئێمە دەبێت بەرپرسی ئەم بازارە بین، ئەمە دیدو بۆچوونی مامۆستای سیاسەتی دەولی (بنجامین سوارتز)ە کە کورتی دەکاتەوە لە سیایەتی ئەمریکاداو بەبێ هیچ شەرمو دودڵییەك دەڵێت بە درێژایی پەنجا ساڵی رابردوو ستراتیجیەتی سیاسەتی ئەمریکا لەسەر ئەوە دارێژراوە کە دەمانەوێت جیهان بکەینە بازارێکی گەورەو لەژێر کۆنترۆڵی خۆماندا بێت[١١٤].

فۆکۆیاما لە کتێبەکەیدا جەخت لەسەر سەنتەریەتی فیکری رۆژئاوایی بە سەرۆکایەتی ئەمریکا دەکاتەوە، ئەمەش لەپێناو دەست گرتن بەسەر جیهانداو فەرزکردنی ویستو ئیرادەی خۆی بەسەریدا، ئەوان دەیانەوێت وەك جولەکەکان بڵێن "ئێمە گەلی هەڵبژاردەی خواین".

ئەمەش بیرکردنەوەیە بە عەقڵیەتی سەنتەرو کەنارو بەڵگە هێنانەوەیە بۆ شەرعیەت دانو سەپاندنی هەژموونی خۆی بەسەر دەوڵەتانی کەناردا، بۆ

---

[١١٣] د.حسين عبدالهادي:العولمة النيوليبرالية، سەچاوەی پێشوو، ل٣٢٤

[١١٤] هەمان سەرچاوە،ل٣٢٦

ئـەم مەبەسـتە دێـتو لـە ڕێگـەی تێڕوانینێكـی فیكریـەوە ئـەم چـاوتێبڕینو داگیركاریــە لــە واقیعــدا دەچەســپێنێت، ئەمریكیــەكان خۆیــان بــە گــەلی هەڵبژاردەی خوا دەزانن. وا دەزانن تەنانەت داگیركاریەكانیـشیان مژدەیەكـە بـۆ گەلـە ژێـر دەسـتەكان، چـونكە ئـەوان لـەم ڕێگەیـەوە پـەیامی ئـازادیو دیموكراسـیو پێـشكەوتن خوازیـان بـۆ دەنێـرن. بـەپێی مامەڵـەو گوتـاری ڕۆژئاواییەكانو بەتایبەتیش ئەمریكیەكان، لـەو بڕوایـەدان كـە مرۆڤـی تـەواو مرۆڤی ڕۆژئاوایە، لەبەرئـەوە پێویـستە كـە هـەموو گـەلانی جیهـان ملكەچـی ئیرادەو ویستو گوتاری ئـەم مرۆڤـە سـپیە بـن، ڕۆژئاواییـەكان تەنانـەت لـە ئاسـتە ئەكادیمیــە بەرزەكانیــشدا ئــەو ڕاســتیە ناشــارنەوەو لــە بــواری جۆربەجۆردا تەعبیری لێ دەكەن، فۆكۆیاما دەڵێـت "ئێمـە لـە ئـەمریكادا لـە كۆتایی سەدەی بیستدا گەورەترین سەركەوتنمان بەدەست هێنا. كە ئەویش لەناوبردنی شوعیەتو تێكشكاندنی عێراق بوو، لە ئێستاشدا كـەس گومـانی لەوەدا نییە كە ئەمریكا ڕابەری گەورەی جیهانـە، ئێمـە ئێـستا گـەورەترینو بەهێزترینین لە جیهاندا" لـە شـوێنێكی تـردا دەڵێـت "گەیـشتنی كۆچبەرە ئەوروپیـەكان بـە ئـەمریكا كـارێكی بەربـەری نـەبوو، بـەڵكو دەسـتكەوتێكی شارستانی بووە، ئایا دەتوانن ئەو خەیاڵە بكەنەوە ئێستا بارودۆخەكە چـۆن دەبـوو ئەگـەر ئـەمریكا پـڕ بوایـە لـە ئـەو مەخلوقـە سـەرەتاییانە"[115] لـەم ڕێگەیەوە فۆكۆیامـا دەیـەوێت شـەرعیەت بـدات بـە ئـەو هـەموو داگیركـریو سـتەمكاریەی كـە ڕۆژئاواییـەكان دژ بـە هیندیـە سـورەكان ئەنجامیانـدا كـە دانیشتوانی ڕاستەقینەی ئەمریكا بوون.

---

[115] فرانسیس فوكویاما:نهایة التأریخ،ترجمة وتعلیق حسین الشیخ،، **سەچاوەی پێشوو، چ**١٩٩٣،ل٧-٨

لێرەوە فۆكیاما دێتو شەرعیەت دەدات بە ئەو هەموو جینۆسایدەی كە ئەمریكیـەكان دژ بـە رەگـەزی راسـتەقینەی ئـەو وڵاتـە كردویانـە، لەلایـەكی ترەوە، تیۆری "كۆتایی مێـژوو" جۆرێـك لـە پـیرۆزی دەدات بـە لیبراتیـەتی رۆژئاوایی‌و وەك ئاینێكی نوێ لە قەڵـەمی دەدات، بـەجۆرێك مامەڵـە دەكـات وەك جۆرێك لە قەدەری خوا باسی دەكات، كـە هـەموو گـەلان دەبێـت بـەبێ پرسیارو رەخنە وەری بگرن‌و ملكەچی بن.

فۆكۆیامـا لـە رێگـەی ئـەم نامەیـەوە دەیـەوێت لیبرالیـزم وەك ئایدیۆلۆژیایەكی پاپـایی پـیرۆز لەقەڵـەم بـدات، كـە رەگـەزە بنـچینەییەكەی (شاری خوا)یە لـە بەرامبـەر (شـاری زەوی). قەشـە (ئۆغـستین) هـاتو لـەم بارەیەوە تیۆرێكی دارشت كە پشت بەستن بوو بە فۆرمێكی پاپـایی. بـەپێی ئەم تیۆرە مەسیح هاتووە بۆ ئاوەدان كردنـەوەی (شـاری خـوا). لەبەرئـەوە مێژووی مرۆڤایەتی لـە دوای مەسـیح بریتیـە لـە ململانـێ لـە نێـوان ئـەو دوو جۆرە شارەدا، ئەوەی كە پاپا لەم ململانێیەدا هەوڵی بۆ دەدا كە لە واقیعـدا بچەسپێت بریتی بوو لە بنیاتنانی دەوڵەتێكی جیهانی كە پاپا لە لوتكەكەیدا بێت[116].

لێرەوە فۆكۆیاما دێـتو بـە لـە جیـاتی دانـان، شـاری پاپـا كـە شـارێكی پـیرۆزە دەگۆڕێـت بـۆ شـاری لیبرالیزمـەكان، لـە پاشـاندادێتو بـاس لـە سیفەتەكانی ئەو شارە دەكات لە خەیاڵدا. لەو شـارەدا سیـستمێكی ئـابوری سیاسی وا لە حوكمدا دەبێت كە نموونەی ئارامی‌و ئاسایش‌و خۆشـگوزەرانی دەبێـت. سـەردەمێكە كـە تیایـدا ئاشـتی دەبەسـتێتو ئـازادی‌و مافـەكانی هاوڵاتی دەچەسپێتو ئەمەش خەونەكانی دوایەمین مرۆڤە.

---

(116) د.محمد عابد الجابري:مسألة الهوية، سەچاوەی پێشوو، ل113

ئەم بۆچوونەی فۆکۆیاما ریشەیەکی مێـژوویی هەیـەو داهێنراوێکـی نـوێی فۆکۆیاما نییە، (دانستی) لە وتەیەکیدا دەڵێت: "ئەگەر بمانەوێت کۆتایی بـە جەنگو هەموو هۆکارەکانی بهێنین پێویستە زەوی‌و هەموو گەلانی ملکەچـی پاشایەك بن، ئەم پاشایە هەموو شتێکی لەبەردەستدا بێت، ژێـر دەسـتەکان داوای هەر شتێك بکەن پێیان بدات، ئەوکاتە دانیـشتوانی ئـەو مەملەکەتـەش هـەموویان لـە پاشـا رازی دەبـن‌و ئاشـتی‌و ئـارامی سـەرتاپای مەملەکـەت دادەگرێت"(١١٧)

ئەم سەنتەریەتە یەکێکە لە گرنگترین سـیماکانی فەلـسەفە لـە رۆژئـاوادا، روناکبیران‌و فەیلەسوفەکانیشی بەردەوام جەختیان لەسەر ئەمـە کردۆتـەوە، ئەمەش بەپێی زەمەن گۆڕانی بەسەردا هاتووەو، لەهەر سەدەیەکدا بەجۆرێك تـەعبیری لێ کـراوە کـە تـەعبیر لـە رۆڵـی ئـەو سـەردەمە بکـاتو لەگـەڵ هۆکارەکانیدا بگونجێت.

لەم سەردەمی بەجیهانیبوونەدا بەشێوەی (پرۆژەی ئاینـدە) تـەعبیری لێ کراوە، کە بە پڕۆژەی دەوڵەتی جیهانی باسی لێدەکەن، کە حـوکمی هـەموو مرۆڤایەتی بکات بە گیان‌و جەستەو هەموو شتەکانیان، ئەم پرۆژەیە تـەعبیر لە گیانێکی پاپایی دەکات کە خەباتو خەوی هەموو هونەرمەندان‌و ئـەدیبان لەخۆ بگرێتو ئیلهام لە ئایدیۆلۆجیاکەی وەربگـرن، ئەمـەش بـە فەلـسەفەی (عەلمانیـەت)ی ئـەوروپی ناسـراوە، لـەم رێگەیـەوە تـەعبیر لـە پرۆژەیـەکی فەلسەفی عەقڵانی دەکەن، بەڵام باکگراوندە پاپاییەکەی دەشـارنەوەو بـاس لــە بنــچینە ئاینیەکــەی ناکــەن، بــەڵام ئەگــەر ســەرنج لــە دامەزرێنــەری راستەقینەی مێژووی فەلسەفەو کولتوری ئەوروپی بدەین، هەرگیز ئەوان ئەو

---

(١١٧) هەمان سەرچاوە، ل١١٤-١١٥

بنەما مێژووییە نەفی ناکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە پشتی پێ دەبەستن‌و دەیکەنە بنەمایەکی بەهێزی فەلسەفەی ئەوروپی، بۆ نموونە قەشەی فەرەنسی (بوسویە) هەموو ئاینەکانی تر جگە لە ئاینی مەسیحی‌و جولەکە هەموویان بە گومڕا لەقەڵەم دەدات‌و دەڵێت: "بەڕاستی مەسیح راستیەکانی ژیانی ئایندەی بۆ خەڵك روون کردەوە ئەوەشی پێ راگەیاندین کە خاچ بریتییە لە (رێگەی گەیشتن بە ئاسمان)، لەبەرئەوە کەنیسە بۆتە هۆکارێکی بنچینەیی لە مێژووداو تەنها رێگەشە بۆ دروستی بوونی، هەر لەبەر ئەوە بوو بەردەوام لە سەرکەوتندا بووە، وە بەردەوامیش بە سەرکەوتوویی دەمێنێتەوەو تێك ناشکێ، هەتا ئەو کاتەی هەموو مرۆڤایەتی لەژێر سایەیدا ئارام دەگرن‌و ئەوکاتە بەرەو ئاسمان بەرزدەبنەوە، کە ئەویش بارەگای راستەقینەیە"(١١٨)

هەر لەم کاتەدا چەند دەنگێکی تر هەبوون کە هەڵقوڵاوی فیکری مەسیحی بوون‌و باسیان لە کۆتایی جیهان دەکرد لەگەڵ نزیك بوونەوەی کۆتایی هەزارەی یەکەم، بەناوبانگترین پێشبینی لەم بوارەدا پێشبینیەکەی قەشە (ئۆغستین) بوو، کە باس لە گەڕانەوەی مەسیح‌و کۆتایی جیهان دەکرد، بەروونی لە دەیەکانی هەشتاو نەوەددا دەبینرا، راستڕەوە مەسیحیەکان زۆر لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە ئەمریکا ئامادە بکەن بۆ هێنانەوەی مەسیح بۆ جاری دووەم‌و راگەیاندنی کۆتایی مێژوو، قەشە (بات رۆبەرشۆو) سەرکردەی بەرەی مەسیحیەکان‌و پاڵێوراوی پارتی کۆماری لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٨٨ کتێبێکی نوسی بەناوی (سیستمی نوێی جیهانی، ئایا سەرەتایەکە بۆ سیستمی جیهانی

---

(١١٨) هەمان سەرچاوە، ل١١٥-١١٦

لاهوتی)، ئەم کتێبەش لە ساڵی ١٩٩٥ بە چاپ گەیەنراوە. لەم کتێبەدا دەڵێت: "ڕاگەیاندنی سیستمی نوێی جیهانی لە دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەتو جەنگی کەنداو ئامانجەکەی بریتیبوو لە بنیاتنانی حکومەتێکی جیهانی یەکگرتوو" مەترسی ئەم بیرۆکەیەش ئەوەیە، کە ئەفسانەیەکی لاهوتی یەو گۆڕاوە بۆ کولتورێکو لە ڕێگەی دامەزراوەیەکی فیکریەوە بانگەشەی بۆ دەکرێتو حکومەتێکی گەورەی جیهانیش لە ڕێگەی میدیاو دامەزراوە جۆربەجۆرەکانیەوە بانگەشەی بۆ دەکاتو لەسەر ئەم بنەمایەش بەپێی ستراتیجیەتێکی نەخشە بۆ کێشراو کار دەکرێت بۆ هەژموونو دەست بەسەراگرتنی هەموو سەرچاوە ئابوریو سیاسییەکان لەسەر ئاستی جیهان.

بیرۆکەی کۆتایی مێژوو و هاتنەوەی مەسیح، متۆربەکردنی هەردوو تەوژمی ڕاستی سیاسیی پارێزگارو ڕاستی مەسیحی (مەسیحی سیاسیی ئوصولیە). سەرۆك (ڕێگان) هەڵگری ئەم بیرۆکەیەبوو کاری بۆ دەکرد، بۆشی باوکیش لەکاتێکدا کە سیستمی نوێی جیهانی ڕاگەیاند لەسەر بنەمای ئەو دیدو جیهانبینیە بوو، لەکاتێکدا کە فۆکۆیاماش کۆتایی مێژووی ڕاگەیاند. مەبەستی ئەوەبوو کە ئەمریکا وەك سەرکەوتوو لەقەڵەم بداتو شکستی ئایدیۆلۆژیەکانی تر بخاتەڕوو، هاوکات هانتینگتۆن ململانێی شارستانیەکانو (بەرنارد لویس) سەرکەوتنی ڕۆژئاوای مەسیحی بە سەرکردایەتی ئەمریکا دژی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی ڕاگەیاند[١١٩].

فۆکۆیاما هەمان بەرگی پیرۆزی مەسیحیەت دەکات بە بەر تیۆرەکەیداو پیرۆزیەکەش ڕاستەوخۆ دەگوازێتەوە بۆ لیبرالیزمو بازاڕی ئازادو دیموکراسی، لە وتەیەکیدا فۆکۆیاما وای لە قەڵەم دەدات کە مرۆڤ هەتا لە

---

(١١٩) رضا هلال:المسيح اليهودي ونهاية العالم،مكتبة الشروق، القاهرة،ج٢٠٠١،١، ل٢٢٣-

کۆتـــایی هـــەزارەی ســـێهەم نزیـــك بێتـــەوە هەســـت بـــە ئـــاوابوونی خـــۆری ستەمکاریو خۆسەپاندنو سۆسـیالیزم دەکـاتو هەسـت دەکـات گۆڕەپـانی جەنگەکـە تـــەنها بـــۆ یـــەك ئایـــدیۆلۆژیا یـــەکلایی دەبێتـــەوە، کـــە ئـــەویش خاسـیەتێکی هەمەلایەنـەو گـشتگیری هەیـە، کـە خـۆی لـە دیموکراسـیەتی لیبراڵیو بیرو رای ئازادی تاکەکەسو سەروەری گەلدا دەبینێتەوە.

لـە دوای دووسـەد سـاڵ لـە بـەرپابوونی شۆڕشـی ئـەمریکیو فەڕەنـسی، بنەماکانی ئازادیو یەکسانی ئەوەیان سەلماند کە نەك هەر بەردەوامن بەڵکو دەتوانرێت سەرلەنوێ تازە بکرێتەوە[١٢٠].

فۆکۆیاما دەیەوێت لە رێگەی مێژووەوە شەرعیەت بۆ بۆچوونەکانی پەیدا بکـات، لەبەرئـەوە پـشت دەبەسـتێت بـە بەڵگـەی مێـژوویی. فۆکۆیامـا دان بەوەدا دەنێت کە کەوتۆتە ژێر کاریگەری فەیلەسوفی ئەڵمانی (هیگڵ).

(هـیگڵو مـارکس هـەردووکیان لـەو بڕوایـەدا بـوون کـە پـەرەسـەندنو پێشکەوتنی مێژوو هەتا کۆتایی نییە، بـەڵکو لـە قۆناغێکدا دەوەسـتێت کـە دەگاتە تێربـوونی پێداویـستیە سـەرەکییەکان، لەبەرئـەوە هـەردووکیان لـەو بڕوایەدابوون کە مێژوو کۆتایی هەیە، لەلای هیگڵ دەوڵـەتی لیبراڵیـەو لـەلای مارکسیش دەوڵەتی شیوعیە[١٢١].

کۆتایی مێژوو فەلسەفەیەکی ئەمریکیە، وەك کۆتایی مێـژوو ئەمـەش لای هیگڵ باسکراوەو سەرکەوتنی ئەڵمانیا لەشـەڕی Jena سـاڵی ١٨٠٦ بەسـەر دەوڵەتی بروسـیای هەڵوەشـاو بـە کۆتـایی مێـژوو لـە قەڵەمـدا، چـونکە ئـەم

---

[١٢٠] فرانسيس فوكوياما:نهاية التأريخ والأنسان الأخير،ترجمة فؤاد شاهين،جميل قاسم،رضا الـشابي.مركـز الإتحاد القومي،بيروت ١٩٩٣،ل٢٥.

[١٢١] البروفيسور زكريا بشير الأمام:في مواجهة العولمة،،ل٦٦-٦٧

سەرکەوتنە هۆکارێکی راستەوخۆ بوو بۆ یەکگرتنی ئەڵمانیا، چونکە هیگڵ وای دەبینی یەکێتی خاکی ئەڵمانیا لەژێر سایەی سمی ئەسپەکانی ناپلیۆن‌و سەربازەکانیدایە، هیگڵ هەلهەلەی بۆ ئەم سەرکەوتنە دەکێشا، چونکە لە سەرکەوتنەکانی ناپلیۆندا گەورەترین هێزی دەبینی بۆ یەکگرتنی ئەڵمانیاو پاراستنی لە پارچە بوون‌و لێك هەڵوەشان(١٢٢).

فۆکۆیاما لە وتارەکەی‌و کتێبەکەیدا گەڕاوەتەوە بۆ ئێستەو مرۆڤی کۆتایی، هەروەها فەلسەفەی هیگڵ چۆنیەتی گەشەکردنی ڕەوڕەوەی مێژوو، بەم هۆیەوە فۆکۆیاما گەیشتۆتە بڕوایەك کە سەرمایەداری لە رووی فیکری‌و ئایدیۆلۆژیەوە سەرکەوتنی بەدەست هێناوەو گەیشتۆتە ئەو ئامانجەی کە دیاریکردووە، لەبەرئەوە ئەمە کۆتایی مێژووە بە مانا هیگڵیەکەی(١٢٣).

**بەدرێژایی مێژووی رۆژئاوا هەر لە قەشەکانی ئایینی مەسیحیەوە بیگرە هەتا بیرمەندەکانی** مۆدێرنیزم‌و دواتریش، بەردەوام جەختیان لەوە کردۆتەوە کە دەبێت مرۆڤی رۆژئاوایی‌و مەسیحی رابەرایەتی جیهان بکات‌و هەر ئەوان دەتوانن گەلی هەڵبژاردەی خوابن، لەبەرئەوە دەبینین کە تەنانەت جەنگەکانیشیان بۆ رۆژهەڵات‌و وڵاتانی تر سیمایەکی پیرۆزی پێ دەبەخشن‌و وای لە قەڵەم دەدەن کە لەپێناو هۆشیارکردنەوەو ئازادی گەلاندایە. "لەبەرئەوە شتێکی ئاساییە کە روناکبیرێکی لیبراڵی نوێ کە نزیکە لە ناوەندەی بڕیار بەدەستی ئەمریکا بگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەی ساسیی هیگڵ‌و

---

(١٢٢) رعد كامل الحيالي:نظريات معاصرة في الصراع الحضاري،، شركة الخنساء للطباعة، بغداد .چ١، ٢٠٠٢ ، ل٧

(١٢٣) محمد محفوظ:الإسلام والغرب وحوار المستقبل، **سەرچاوەی پێشوو**، ل١٤٤

به عەقڵیەتێکی تر دێتو ئەو هەرەسەی کە بەسەر بلۆکی رۆژهەڵاتدا هات بقۆزێتەوەو بە سەرکەوتنی بۆچوونەکانی سەرمایەداری لێکی بداتەوە"[١٢٤]

ئەگەر سەیری هەردوو تێڕوانینە مارکسیەکەو لیبراڵیزمەکە بکەین لەوەدا هیچیان جیاوازیان نییە کە خۆیان بە پەیامی کۆتا مرۆڤ لە قەڵەم دەدەن، چونکە ژینگەو جیهانبینی هەردووکیان هەڵقوڵاوی یەك مێژوو شارستانیەتو کولتورە، بەڵام دواجار مارکسیزم لە رۆژئاوادا جێگەی نابێتەوەو دەچێتە رۆژهەڵاتو لەوێوە داوای چەسپاندنی بۆچوونە فیکریەکانی دەکات.

جەنگی کۆتایی مێژوو لای مارکسیش هەبووە، مارکس مێژووی گەشەی مرۆڤایەتی دابەش دەکات بۆ پێنج قۆناغو قۆناغی پێنجەم کە قۆناغی شیوعیەتە کردویەتیە کۆتایی مێژوو، کە تیایدا ململانێ نێودەوڵەتیەکان کۆتایی پێ دێت، دەوڵەت نامێنێت، ئایدیۆلۆژیا کۆتایی پێ دێتو لەم کاتەدا ئازادیو دادپەروەری باڵ دەکێشێت بەسەر کۆمەڵگەداو مرۆڤ هیچ ستەمکاریو ناعەدالەتیەکی بەرامبەر ناکرێت. لەکاتێکدا کە شۆڕشی بەلشەفی لە روسیای قەیسەریدا سەرکەوت، (لنین )مژدەی بە گەلانی جیهان دەدا کە مێژوویەکی نوێ لە دایك بووەو (مێژووی ململانێ کۆتایی پێهاتووە)و ئەمەی بەسەرەتای گواستنەوەی جیهان دانا لە سەرمایەداریەوە بۆ سۆسیالیزمی[١٢٥].

لەپێش فۆکۆیامادا زۆر دیدو تێڕوانینی تر هەبوون دەربارەی کۆتایی مێژوو، هەریەکەیان بەپێی بۆچوونو زەمەنی خۆیانو باری گەشەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکانیان باسیان لێکردووە، فۆکۆیاما لێرەوە دێتو کەڵك

---

[١٢٤] د.السيد ولد أباه:اتجاهات العولمة، **سەچاوەی پێشوو**، ل١٥١

[١٢٥] عبدالاله بلقريز :في البدء كانت الثقافة، افريقا الشرق، المغرب، چ١، ١٩٩٨،ل٣٤.

له هەموو ئەو تیۆرو بۆچوونانە وەردەگرێتو تیـۆرێکی نـوێو لـەژێر نـاوێکی نوێدا بە ناوی (کۆتایی  مێژوو) دادەڕێژێت، بەڵام ئەمجارەیان له بارودۆخێکی نـوێی جیهـانیو سـەدەی تـەکنۆلۆژیاو شۆڕشـی زانیاریدایـە، کـە هـەمووی پەیوەسـت دەکاتـەوە بـە سیاسـەتو جیهـانبینی ئـەمریکاو دیـدو تێڕوانینـە جیاوازەکانو دەیخاتەوە ژێر هەژموونی جیهـانیو سیـستمی سـەرمایەداریو لیبراڵی.

لەبەرئەوەی فۆکۆیاما لەناو دامەزراوەیـەکی سیاسـیی نزیـك لـە ناوەنـدی بڕیاری ئەمریکا کاری کردووەو وەك راوێـژکارێك دیـدو بۆچـوونەکانی داوەتـە دامــەزراوە سیاســیو ســەربازیەکان، لەبەرئــەوە شــتێکی ئاســاییە کــە بۆچـوونەکانی خزمـەت بـووە بـە گوتـارێکی سیاسـیو لـەپێناو بـەدیهاتنی ئامانجـە سیاسـییەکانی ئـەمریکادا بـووە. فۆکۆیامـا لـەپێش بڵاوکردنـەوەی کتێبەکەیـدا وتــارێکی نوســیبوو بــەناوی (ســەرکەوتنی رۆژئــاواو فیکــری رۆژئاوایی) مانای شەکەت بوونی تـەواوی سیـستەمە بەدیلـەکانی لیبراڵیـەتی رۆژئاوا بوو[١٢٦].

ئەم بۆچوونە تەعبیر بوو لە (کۆتایی ئایـدیۆلۆژیا)وە لەلایـەکی تریـشەوە باسکردن بوو لە کۆتایی سیاسەت لەپێناو پشت بەستن بە ئابوری.

فۆکۆیاما لە رێگەی کۆتایی مێژوەوە دەیـەوێت پێمـان بڵێـت کـە کۆتـایی ئایدیۆلۆژیاو بیروباوەڕە گەورەکانە. جـا ئەمانـە ئـایینی بـن یـان نـا ئـایینی، هەروەها بۆیە دەیەوێت ئەوەمان پێ بڵێت کە سیاسـەت لێـرەدا کۆتـایی پـێ دێت سیاسەت بەو مانایەی کە شـێوازی بـەڕێوەبردنی دەوڵـەت بێـت، بـەڵکو

---

[١٢٦] راسل جاکوبي:ن
هاية اليوتوبيا،ترجمة:فاروق عبدالقادر، عالم المعرفة، ع/٢٦٩،مطابع الوطن،الكويت،٢٠٠٠م .چ١،ل٢٠

دەیەوێت جەخت بکاتەوە لەسەر ئەوەی کە ئیتر ئابووری ڕۆڵی کارا دەگێڕێت لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتداو لە ڕێگەی ئابوریشەوە دەتوانرێت کار لەسەر هەموو کایەکانی تر بکرێت، وە ئەو کایە ئابوریەش کایەی بازاڕی ئازادە کە بنەمایەکی گرنگی لیبرالیەتی ڕۆژئاوایەو دواجار کۆمپانیا مۆنۆپۆڵە ئەمریکییەکانو ڕۆژئاواییەکان بەگشتی ئەو ڕۆڵە دەبینن.

لە بۆچوونێکی تریدا جەخت لەسەر ئەو راستییە دەکاتەوەو دەڵێت: "سەرکەوتنی کۆتایی دیموکراسیەتی لیبرالی ڕۆژئاوایی نابێتە هۆی سەرکەوتنی ئایدیۆلۆژی یان خاڵی بەیەکتر گەیاندنی سەرمایەداریو سۆسیالیستی، بەڵکو سەرکەوتنی بێ وێنەی لیبرالیزمی ئابوریو سیاسییە"[١٢٧] تیۆری (کۆتایی ئایدۆ لۆژیا) پێشینەیەکی دیاری هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لەسەدەو نیوێك پێش ئێستا، دۆزینەوەی فەیلەسوف و ڕوناکبیرە ڕۆژئاوایەکان، هەریەکە بەجۆرێك تەعبیریان لێ کردووە، بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا جارێکی تر دەگەڕێتەوە سەر گۆڕەپانەکەو لەدیدێکی فیکری سیاسی نوێوەوە خۆی نمایش دەکاتەوە، لەبەر ئەوە لە زۆربیەی ئەو نوسینانەی کەلەسەر بابەتی کۆتایی ئایدۆلۆژیا نوسراون بانگەشەی بۆ دەکەن لەناو ئەوانەشدا دنیایەك ململانێ و ناکۆکی سەخت هەست پێ دەکرێت، زۆرجار هەست دەکرێت لەناو ئەو بانگەشانەدا ئایدۆلۆژیایەك خۆی مەڵاس داوەو دەیەوێت بەبەرگێکی نوێوە خۆی نمایش بکات، واتە ئەمەش پلانێکی تر دژ بەجۆرێك لەئایدیۆلۆژیاو برەودانە بە ئایدیۆلۆژیایەکی تری متوربە کراو بە کلتورێکی تر، بەڵام ئەمجارەیان لەژێر ئەم بارودۆخە نوێ یەی کەلەئارادایە لەپێشکەوتنی تەکنەلۆژی و زانستی و هونەری، واتە

[١٢٧] هەمان سەرچاوە

جارێکی تر بیّ بەش کردنەوەی ئەو نەتەوانەیە کەتوانای بەرهەم هێنانی تەکنەلۆژیاو زانستیان نیە لەبوونی هەر ئایدۆ لۆژیاو ئاین و بیرو باوەڕێك واتە هەولّدانە بۆ بەرهەم هێنانەوەی ئایدۆلۆژیایەك کە لەفەزای نویّ ی بەجیهان بووندا کەئەویش تەنها لە فیکرو مێژوو کلتوری نەتەوە بالاّ دەستەکانەوە سەرەچاوە دەگرێت .

زۆر نوسەری ناودار هەیە کە وەك (بیل) کە باسیان لە کۆتایی ئایدۆلۆژیا کردووە، هەروەها (دیجۆن ئارۆن) لەکتێبی (ئەفیونی ڕۆشنبیران) یان کۆتایی مێژووی (فۆکۆمایا) (بیل و فۆکۆمایا) باس لە کۆتایی ئایدۆ لۆژیای سەدەی نۆزدە دەکەن، ئەویش پاش ئەوەی کە یەکێتی سۆڤیەت هەرەسی کرد، ئەوان لەو بڕوایەدان کە پێشکەوتنی تەکنەلۆژی دەبێتە هۆی جۆرێك لەبەیەك گەیشتنی ئایدیۆلۆژیاکانی وە لە ئەندامی ئەمەشدا یەك ئایدۆلۆژیا هەژموونی خۆی بەسەر جیهاندا دەسەپێنێت .

بۆیەکەمین جار چەمکی (کۆتایی ئایدۆلۆژیا) لە نوسینەکانی نوسەرو ڕۆماننوسی بەناوبانگی فەرەنسی (ئەلبیرکامۆ) لەساڵی (١٩٤٦) سەری هەلّدا، لە ووتارێکدا کە لەڕۆژنامەی (بەرگری)دا بلاّوی کرۆتەوە، ڕەخنەی لەهەولّی سۆسیالیستە فەرەنسیەکان گرتبوو کە وویستبویان ئاشتبوونەوەیەك لەنێوان مارکسیزم و ئەخلاقدا دروست بکەن، لەدوای چەند ساڵێك مامۆستایەکی گەروەی زانکۆی (هارڤارد) بەناوی (ها.ستیوارات هیوز) پێشبینی (کۆتایی ئایدۆ لۆژیای)کردووە، لە توێژینەوەیەکدا باس لە سروشت و شێوازی بیرکردنەوەی ڕووناکبیرانی ئەورووپی دەکات و تێبینی ئەوەی کردووە (ڕوناکبیری چەپی ئەورووپی (گەیشتۆتە ئەو ڕاستیەی) کەئەمەش

وەك شۆكێك وایە بۆیان (سەرمایەداری لایان بەرێزترە لەماركسیزم) لەبەر ئەوە لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە ئەم دیاردەیە رولەهەڵكشانە .

لەم ووتارەدا هیوز باس لە (كۆتای ئایدۆ لۆژیای سیاسی) دەكات، لەساڵی ١٩٥١ دا ئەو لەو بڕوایەدایە كە (چەپەكان بڕوایان بە فیكرو بیروڕا)نەماوە[١٢٨]، كۆمەڵێكی تریش لە توێژەرو نوسەرو ڕوناكبیری تر هەن، كەدەربارەی كۆتایی ئایدژلۆژیا بابەتیان نوسیوە لەوانەش (جۆ دیس.ن. شكلار) لە ساڵەكانی پەنجادا لەكتێبێكی دا بەناوی (لەدوای یۆتۆبیا) هەرەسی ئیمانی سیاسی (سمۆن مارتین لیبست) هاوڕایە لەگەڵ ئەو نوسیەنەداو ئەویش لەوبڕوایەدایە كە سیاسەت لە ئێستادا كارێكی زەحمەتە، بەم هۆیەشەوە كتێبێكی نوێی بەناوی (مرۆڤی سیاسی) كە لەساڵی ١٩٦٠ دەرچووە، كە ئەویش فیكرەكەی لەو ڕۆژنامە نوسە سویدیە وەرگرتووە كە دەڵێت (ئێستا گەورەترین كێشە ئەوەیە كە چۆن كرێكاری كانەكان بتوانن كرێیەكی زیاتر وەربگرن، یان لەكاتی زیاد بوونی نرخی شیردا چی بكەن).

یان چی بكرێت بۆ زیاتر بەدەمەوە چوونی بەساڵاچواندا لەلای (لیبیست .. هەروەك لای (ئارون)یش هەروایە (گرفتە سیاسیە بنەڕەتیەكانی شۆڕشی پیشەسازی) نابێتە هۆی دروست كردنی ناكۆكی ئایدۆ لۆژی، لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە ئەو سەركەوتنەی كە شۆڕشی دیموكراسی كۆمەڵایەتی لە ڕۆژئاوادا بەدەستی هێناوە، بوەتە هۆی ئەوەی كە كۆتایی بۆ سیاسەت دابنێت لەئاستی ناوخۆیی و هەرێمایەتیدا، بەلام بەنیسبەت ئەو

[١٢٨] راسل جاكوبي:نهاية اليوتوبيا،مصدر سابق، ل١٣-١٤.

ڕۆشنبیرانەی کە پێویستە خاوەنی ئایدۆلۆژیا یان یۆتۆپیا بن ئەوە پاڵیان پێوە دەنێت بۆ ئەوەی کەکاری سیاسی بکەن[١٢٩].

فۆکۆیاما شتێکی تازەی نەهێناوە، بەڵکو هەمان بۆ چوونەکانی پێش خۆیەتی، بەڵام بەبەرگێکی تازەوە لەڕوداوێکی سیاسی نوێدا، فۆکۆیاما دەیوسیت بڵێیت کەسەردەمی ئایدۆلۆژیای سیاسی کۆتایی هاتووە، بەڵگەی یەکەم و کۆتاشی تەنها لەسەر هەرەسی مارکسیزم بوو، لەم ڕوانگەیەشەوە دەڵێت مرۆڤی کۆتایی، مرۆڤ پێشکەوتوی لیبرالی ڕۆژئاواییە بەتایبەتیش ئەمەریکی کەپیاوی سپیە، ئەم مرۆڤە نمونەیە لەهەموو ڕوویەکەوە، مرۆڤی ئێستا و داهاتوو مرۆڤێکی بەکاربەری شمەك دەبێت نەك ئایدیۆلۆژیا، لەجیاتی ئایدۆلۆژیا بازاڕ دێت و ئەو بۆشاییە پڕدەکاتەوەو جێگەی دەگرێتەوە لە ڕوانگەی فۆتۆکۆباماوە کۆتایی مێوو ڕوداوێکی زۆر خەمناك دەبێت، چونکە خەبات کردن لەپێناو جیاکاری و لەجیاتی ئەوەی تاکەکان گیانی خۆیان بخەنە مەترسیەوەو قوربانی بدەن بۆ ئامانجێکی پیرۆز یان ململانێی ئایدۆلۆژی بکەن لەسەر ئاستی جیهان و ئازایەتی و قارەمانێتی بنوێنن و پاڵەوانێتی تۆمار بکەن، لەجیاتی هەموو ئەمانە بابەتە ئابوریەکان و گرفتە تەکنیکیەکانی و گرنگی دان بەژینگە و پێداویستیەکانی بەکاربەران جێگەی دەگرێتەوە .

ئەمانە نابنە ماددەیەکی شیعری و فەلسەفی، بەڵکو هەموویان دەچنە رەفەی مۆزەخانەکانی مێژووی مرۆڤایەتیەوە[١٣٠] ڕەخنەی زۆر لەسەر تێۆری (کۆتایی مێژوو)ی فۆکۆباما نوسراوە، چونکە مارکسیزم هەڵقولاوی فیکری

---

[١٢٩] هەمان سەرچاوە، ل١٤-١٥

[١٣٠] هەمان سەرچاوە، ص٢١

ڕۆژئاواییە لەڕوی فیکری و فەلسەفی ئەڵمان و ئابوری سیاسی ئینگلیزی و فیکری کۆمەڵایەتی فەرەنسی، درێژ کراوەی جەدەلی هیگلی و ئەنترۆپۆلۆژیای ئاینی فیورباخە لەگەڵ بۆ چوونەکانی ریکاردۆ و فەلسەفەی وەزعی کۆنت، لەبەر ئەوە هەرەسی یەکێتی سۆڤیەت بەدواشیدا وولاتانی مارکسیستی، بەئاشکرا ئەوەمان بۆ دەردەخات کەچەمکی (کۆتایی ئایدۆلۆژیا) هیچ نیە تەنها گەمەیەکگی ئیمپڕیالیزمە، کە هەوڵی چەسپاندنی تیۆری (کۆتایی مێژوو) دەدات، ئەویش لەپێناو برەودان بە نموونەو جیهانبینی سەرمایەداری ڕۆژئاوایی[131].

لەبەر ئەوە باس کردن لەمردنی ئایدۆ لۆژیاو نەمانی کاریگەری سیاسی کۆمەڵایەتی و شارستانی، هاوکاتە لەگەڵ گۆڕانکاریە جیهانیەکان و بانگەشەیە بۆ کولتورێکی جیهانی و ئابوریەکی گەردوونی، لەبەر ئەوە ئەم تیۆرە لەم کاتەدا خزمەت لەو ئاراستە سیاسیە دەکات کە ئێستا لەئارادایە و دەیەوێت شێوازێکی دیاری کراوی شارستانی بەسەر هەموو جیهاندا فەرز بکات[132].

(دەتوانین بڵێین تیۆری کۆتایی ئایدۆلۆژیاو کۆتایی مێژوو) هیچ نیە تەنها بانگەشەی ئایدۆلۆژیایەکی نویێ نەبێت، لەهەر پێگەیەکەوە سەری هەڵدابێت، تەعبیر لەئایدۆلۆژیایەك دەکات واتە دەتوانین بڵێن باس لەناسینی خۆی و سیستەمەکەی دەکات، ئەویش لەڕێگەی وەرگرتنەوەو داڕنینی شەرعیەت لەهەر ئایدیۆ لۆژیایەکی ترو بۆ ئەوەی کە هەموو شتە باشەکانی بخاتە پاڵ

---

[131] محمد محفوظ:الإسلام و الغرب، سەچاوەی پێشوو، ل١٤٢

[132] هەمان سەرچاوە، ص١٤٣

خــۆی، ئــەویش لەڕێگــەی بانگەشــە بــۆ ڕزگــاربوونی سیــستەمەکەی لەئایدۆلۆژیا[١٣٣].

ئەگــەر ســەرنج بــدەین، لــەدوای هەرەســی کوتلــەی سۆسیالیــستی، ناڕەزاەتیــەکان لەبەرامبــەر ڕۆژئــاوادا کۆتاییــان نــەهات، بــەڵکو چــین وەك هێزێکی ئابوری گەورە بەرامبەر هەژموونی ئەمــەریکا وەســتایەوە، هــەروەها زۆر لە وولاتانی باشوری ڕۆژهەلاتی ئاسیا و زۆر لـەوولاتانی ئیسلامی توشـی زیانێکی گەورەبوون بەهۆی هەژموونی ئابوری و سیاسی ڕۆژئـاوا، کارەسـاتە ئابوریەکــەی باشــوری ڕۆژهــەلاتی ئاســیاش یــەکێك بــوو لــە شــوێنکاری سیاسەتەکانی ڕۆژئاوا، ئەگەر سەیری جیهانی ئیسلامیش بکەین دەبینین کـە بزاڤێکی ئیسلامی بەرفراوان هەیە کـە داوای گەڕانـەوە دەکـەن بـۆ شوناسـی ئیـسلامی و دروسـت کردنـی نموونەیـەکی کلتـوری و سیاسـی سـەربەخۆ کـە تەعبیر لەشوناسـی کلتـوری گـەلانی ناوچـەکە بکـات هـەروەها ئەگـەر سـەیر بکەین لەئاستی ئەوروپاشدا بەرگریەکی توند هەیە دژ بە هـەژموونی کلتـوری ئەمەریکی، هەربەئەم هۆکارەشەوەیە کە هانیتنگتۆن دێت و داوا دەکـات کـە ڕۆژئاواییەکان واز لەتیۆری کۆتایی مێژو بهێنن و بۆ ئەم مەبەسـتەش تیـۆری ململانێی شارستانیەکان دەخاتە ڕوو، داوای ئەوە دەکـات کـە ڕۆژئاواییـەکان هەموویان یەك بگرن بەرامبــەر مەترسیەکانی ئاینـدە کەلـە شارسـتانیەکانی ترەوە ڕوی تـێ دەکـات و بـۆ ئـەم مەبەسـتەش دەڵێـت ڕۆژئـاوا لـە ئێـستادا جیهانی نیە و کلتورو شارستانیەتەکەی پەیوەستە بـەجوگرافیای ڕۆژئـاواوەو هـیچ ناڕۆژئاواییـەکیش بەبـەکارهێنانی کەرەسـەو خـۆراکی ڕۆژئـاوایی نابێـت ڕۆژئاوایی .

[١٣٣] عبدالاله بلقريز :في البدء كانت الثقافة، سەچاوەی پێشوو، ل٣٣

سەرەڕای ڕوەباشـەکانی دیموکراسـیەت لـەڕوی سیاسـیەوە بـەڵام ئەگـەر سەیری دیموکراسیەت بکەین لەڕوی ئابوریەوە نەك نـەیتوانیوە دادپـەروەری بچەسپێنێت، بـەڵکو جیهـانی دابـەش کـردووە لـەنێوان دەوڵەمەنـدو هـەژارو پێـشکەوتوو دواکـەوتوو، کـردەوە لـەنێوان دەوڵەمەنـدو هـەژارو پێـشکەوتوو دواکەوتوو، بەپێی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەو راپۆرتەکانی گەشە پێدانی مرۆیی و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ، سـتەمکاری و هـەژاری و نـەداری و نـەبوونی لـەم دەیەی دوایدا چەندان جار زیادی کردووە، ئەویش تەنها بەهۆی پلانی ووڵاتە زلهێزەکـان و کۆمپانیـا فـرە ڕەگەزیـەکان ی ڕۆژئـاواو دامـەزراوە جـۆر بەجۆرەکانیانـەوە بـووە، لەبەرئـەوە لەئێستادا دەبیـنین کـە دیموکراسـیەت دیلـی بـازارەوەو پیـاوانی کـارو کۆمپانیـاو ڕاگەیاندنـەکان و ڕێکخـراوە نێـو دەوڵەتیـە ڕۆژئاوایـەکان ئاراسـتەی دەکـەن بەبەرژەوەنـدی خۆیـان لـەم سەردەمەدا جۆرێکی تر لە کۆیلایەتی گەڕاوەتەوە .

لـەژێر بـارودۆخی ئـەم سیـستەمە نوێیـەدا بەشـێکی زۆر لـەمرۆڤ هەیـە ئیستیغلال دەکرێت، ئەویش لەژێر ناوی کۆیلایەتی یان قەناعەت یان کرێ ... هتد، خۆشگوزەرانی کەمینەیەکە ئێستا لەسەر حسابی ژیانی زۆرینەیەکە، بۆ زۆر لە مرۆڤەکان مانەوە لەژیاندا مانای خۆشگوزەرانی ناگەیەنێت

بەڵکو بۆ ئەم جۆرە مرۆڤانە تەنها گرفت و نەخۆشی و هەژاریـە، زۆر جـار ئەو پرسیارانەشیان بۆ دروست دەبێت، ئایا بۆچی بژی لەکاتێکداکەئەم ژیانە هەر گرفت و ناڕەحەتی بێـت، ئایـا تـەنها بـۆ بەدەسـت هێنـانی نانێك ئـەوە دەهێنێت کە بەردەوام عەرەقی بەناوچاویدا بێتە خوارەوە(١٣٤) .

(١٣٤) د.رجب بودبس:العولمة بين الأنصار والخصوم سەچاوەی پێشوو، چ١٠١

لەبەرواری ٢٤ کانونی دووەمی ٢٠٠١ دا ڕێکخراوی کاری نێودەوڵەتی لەبڵاوکردنەوەیەکیدا دەڵێت :

١- یەك لەسەر سێی هێزی کار لەجیهاندا کە دەکاتە (سێ ملیار کەس) لەبێ کارییەکی تەواودا دەژین و نیوەشیان لەژێر هێڵی هەژاریدان .

٢- ڕاپۆرتەکە نزیکەی (٤٠٠) لاپەڕە دەبێت دەربارەی بێ کاری لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوودا ژمارەیان (١٦٠) ملیۆن کەس دەبێت .

٣- نزیکەی (٨٤٠) ملیۆن کەس پێویستیان بەکاری تەواوو چەسپاو هەیە و زۆریش لەمانە بەشوێن کاردا دەگەڕێن .

بەجیهانی بوونی ئابوری جیهانی سێیەمی دروست کردووە لەناو هەموو وڵاتانی جیهاندا، لەنێوان هەریەك لەو وڵاتانەشدا جیاوایەکی زۆری لەنێوان تاکەکانـدا دروست کـردوە، بۆ نموونە لەئەمەریکادا ١٪ ی، دانیشتوانی نزیکەی ٥٠٪ ی سامانی وڵاتەکەی لەژێر دەستدایە، بەڵام نزیکەی ٨٠٪ ی دانیشتوانی تەنها خاوەنی ٨٪ ی ئەو سامانەیە، ئەم نمونەیەش کە دەبینرێت بەجیهانی بوون دەیەوێت بیکاتە نمونەیەکی نادادپەوەررانەو بەسەر هەموو وڵاتانی جیهاندا پەخشی بکات[١٣٥] .

ئەمە ئەو کۆتای مێژووەیە کە فۆکۆباما باسی دەکات و ئەو خۆشگوزرەانیە یە کەوەك دیاری بۆ گەلانی جیهانی دەهێنێت، ئایا ئەمە ئەو سیستمەبوو کە مرۆڤایەتی خەباتی بۆ کرد هەتا پێی بگات، ئایا ئەمە لێژبوونەوە نییە بەرەو تیاچوون ؟ بەپێی سوننەتەکانی خوای گەورە و یاساکانی بزاوتی مێژووی (هەر هەنگاوێك بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگە، دەبێتە دابەش بوونی بەسەر چەند چینێکدا) بەمەش کەمینەیەك دەسەڵاتی

---

[١٣٥] عبدالحي يحيى زلوم:نذر العولمة،المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت،چ١، ١٩٩٩،ص٥

خـۆی زاڵ دەکـات و بەمــەش ڕۆژ بــەڕۆژ کۆمەڵگــە بــەرەو لــەناو چــوون دەچێت[١٣٦] ئەگەر سەیری ئەو قەیرانە ئابوریەش بکەین کـە ئێـستا ڕۆژئـاواو بەتایبەتیش ئەمەریکا تێی کەوتووە، کە بووەتە هۆی ئیفلاس کردنی دەیـان بانکی گەورەی جیهانی و بەم هۆیەشەوە هەموو دانیشتوانی کیشوەری سپی کەوتونە دڵە ڕاوکێ و مەترسـیان بـۆ سـەر ژیـانی ئاینـدەیان دروسـت بـووەو گوزەرانیـشیان ڕۆژ بـەڕۆژ بـەرەو خراپــی دەچـێت و هەنـدێك وولاتــی وەك ئیتاڵیـاو یۆنـان لەبـەردەم هەڕەشـەی هەرەسـی ئـابوری گـەورەدان و ئـەم ڕووداوانە ئەوەیان سەلماند، کە گرفتەکە لەناوخودی لیبڕاڵیزمـی ڕۆژئاوادایـە بەتایبــەتی ڕوە ئابوریەکــەی و بــازاڕی ئــازاد، چــونکە لــەژێر ئــەم نــاوەدا مافیایەکی نێودەوڵەتی لەبازرگان و پیاوانی کارو ڕێکخراوی گەورەی ئـابوری دروست بوون کـە تـەنها مەبەسـتیان قازانجـە و دواجـاریش هەڕەشـە لەسـەر ژیانی کۆی مرۆڤایەتی دروست دەکەن .

[١٣٦] الدكتور عمادالدين خليل:التفسير الإسلامي للتأريخ،دار العلم للملايين،بيروت،١٩٩١ل٨٣.

## دووەم: ململانێی شارستانیەکان

## یان هەڕەشەکردن لە کولتورەکانو دروستکردنی دوژمن

ململانێ یەکێکە لە بنچینەکانی پێکهاتەی فیکری رۆژئاوایی، ئەمەش لە قۆناغە یەك بەدوا یەکەکانی ژیانی سیاسیی رۆژئاوادا دەبینرێت، شارستانیەتی رۆژئاوا هەر لە سەرەتاوە لەسەر ئەم چەمکە دروست بووە، لە سەردەمی یۆنانو رۆمانیدا چەمکی ململانێ بە جۆرەها شێواز بەردەوام بووە، ئەم دوو ئیمپراتۆریەتە بەردەوام لە جەنگدا بوون لەگەڵ دراوسێکانو شارستانیەتەکانی تردا. لە فیکری یۆنانی کۆندا ئەم چەمکە بوە بەجۆرێك لە بیروباوەڕی ئایینیو پێی وتراوە (ململانێی خواکان) یان ململانێی مرۆڤ لەگەڵ سروشت، یان (ململانێی نێوان مرۆڤو خوا) یان (ململانێی بەهێزو بێ هێز).

لە فیکری رۆمانیشدا ململانێ لە هەموو شێوەیەکدا بوونی هەبووە، لەلایەنەکانی فیکریو سیاسییو فەلسەفیو یاسا دانانیشدا، لەو سەردەمەدا تیۆری جۆراوجۆر دەرکەوتوون کە نەزعەی ململانێیان قوڵ کردۆتەوەو وەك ژێرخانێکی فیکریو مەعریفی شارستانیەت رۆژ بەرۆژ بانگەشەیان بۆ کردووە وەك هیگلیەت لە فەلسەفەی مێژوو، داروینی لە فەلسەفەی پەرەسەندنو لەناوبردنی لاوازەکان لەلایەن بەهێزەکانەوە، هەروەها ململانێی چینەکان کە بریتییە لە ژێرخانی فەلسەفەی ململانێو دژایەتی لە نێوان چینو توێژە کۆمەڵایەتییەکاندا[١٣٧].

---

[١٣٧] د.محمد عمارة:الحضارات العالمية تدافع؟-أم صراع؟ في التنوير الإسلامي(٢٤)،، نهضة مصر، القاهرة، ط١٩٩٨،١،ل٦-٧

ئەمەش پەیوەستە بە نەزعەیەکی رۆژئاوایی کە بەردەوام لە هەوڵی سەپاندنی هەژموونی خۆیدابووە بەسەر ئەوانی تردا بۆئەوەی ملکەچیان بکات و وەك بەندەی خۆی مامەڵەیان لەگەڵدا بکاتو لە ئەم رێگەیەشەوە دەست بگرێت بەسەر سەرچاوەی دەرامەتو داراییەکانیانداو وڵاتایان بخاتە ژێر چنگی خۆی لە سەدەکانی رابردوودا ئەم ململانێیانە بەشێوەی ئیمپریالیزمی تەقلیدی دەچوون بەرێوەو بەرێگەی سەربازی ئامانجەکانی دەهێنایە دی.

نووسراوی زۆر هەیە، کە باس لە سەنتەریەتی فیکرو شارستانیەتی رۆژئاوایی دەکات، کە هەمووی باس لەوە دەکات رۆژئاوا لە فیکری خستنەژێر دەستی ئەوی تردایەو دەیەوێت هەڵی بلوشێتو بیکات بە بەشێك لە شارستانیەتی خۆیو هەمان بەهاو مەنزومەی خۆی پێ بدات. ئەمەش ویستی ئەو پەیوەندیەیە کە دەیەوێت لەگەڵ ئەویتردا دروستی بکات، لەم رێگەیەشەوە دەیەوێت تایبەتمەندیو شوناسی خۆیان لە بیرببەنەوەو بیکات بە بەشێك لە خۆی، ئەمەش پەیامی ئەو شارستانیەتە ناوازەیە کە بۆ بەرامبەرەکان هەیەتیو دەیەوێت بەرامبەرەکان بە مەدەنی بکات[138].

لەم روانگەیەوە دەتوانین بڵێین کە ئەم نەزعە رۆژئاواییە لەگەڵ پێشکەوتنی زەمەندا، ئەویش ئالیەتەکانی دەگۆڕێتو بە شێوەیەکی نوێ نمایشی خۆی دەکات، بە درێژی شەڕی سارد رۆژئاوا لە بەرامبەر رۆژهەڵاتدا جۆرێك لە گوتاری ئەکادیمیو شارستانی تایبەتی هەبوو کە بە ئیمبراتۆریەتی شەڕ لە قەڵەمی دەدا، لەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی ساردیش، رۆژئاوا کۆمەڵێك تیۆری نوێی داهێنا ئەویش بۆئەوەی ئیتر خۆی وەك تاکە هێزی

[138] د.محمد عمارة:تقديمه لكتاب،حوار الحضارات، عطية فتحي،چ١، مكتبة المنار الإسلامية، ل٨

سەرکەوتوو لە قەڵەم بداتو بۆ سەدەی بیستو یەك، بۆ ئەم مەبەستەش لە گۆڕەپانی سیاسییو کولتوری دا چوار چەمکی نوێی داهێنا کە ئەمەش بوە مەنهەجێکی کولتوریو سیاسییو ئابوریو کۆمەڵایەتی، لەم روانگەیەشەوە رۆژئاوا مامەڵە لەگەڵ ئەوانی تردا دەکات، لەو چەمکانەش سیستمی نوێی جیهانی، کۆتایی مێژوو، ململانێی شارستانیەکان، بەجیهانیبوونی ئابوری نویێ.. هتد.

ئەگەر سەیری زۆربەی ئەو چەمکە بەکارهێنراوانە بکەین لە بواری کولتوریو فیکریدا، هەمووی تەعبیر لە سەرنتەربوونی رۆژئاواو دەسەڵاتەکەی دەکات، کە دەیەوێت کۆنترۆڵی جیهان بکاتو هەموو مەعریفەی رۆژئاواش لەم تەوەرەیەدا دەسورێتەوە. رۆژئاوا دەیەوێت هەموو کولتورەکانی تر لەناو خۆیدا بتوێنێتەوەو پێگەیەك بۆ ئەوانی تر ناهێڵێتەوە. لەبەرئەوە لەم فەزایەدا دەبێت هەموو نەتەوەکان قوربانی بدەن بە رەسەنایەتیو تایبەتمەندییانو لەم روانگەیەوە دەتوانین بڵێین هیچ بوارێك نییە بۆ ناسینی نەناسراوەکانو ئەوانی تر[١٣٩].

لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەو ململانێیەی کە سەلەفیەتی رۆژئاوایی سەرمایەداری باسی دەکات، پشت بە بانگەشە کۆنەکانی سەرمایەداری ئیمپریالیزمی دوێنێ دەبەستێت، ئەمە لەکاتێکدایە کە سەرمایەداری خۆی شکست هێنانی ئەم فیکرەیەی سەلماند، کە نەیتوانی لەگەڵ پێشکەوتنەکانی سەردەمدا بگونجێت، بەڵام ئێستا ئەم سەرمایەداریە، گۆڕیویەتی بە چەند

(١٣٩) محمد محفوظ: الإسلام، الغرب،وحوار المستقبل، سەچاوەی پێشوو، ل١١٧

بنەمایەکی تر کە ئامانجی تەنها کۆکردنەوەی سەرمایەیەو ئەمەش بوە بە ئامانجی یەکەمو کۆتایی[١٤٠].

لەکاتێکدا کە سیستمی دوو جەمسەری هەرەسی هێناو شکستی خوارد کە ئەمەش لە دوای رووخانی یەکێتی سۆڤیەتو کوتلەی سۆسیالیستی بوو، لەگەڵیدا چەمکی ئایدیۆلۆژیاش شکستی خوارد، کە چەمکێکی میحوەری بوو لەکاتی شەڕی ساردا، لەسەر لاشەی ئەمە چەمکی شارستانیەت سەری هەڵدا. چەمکی شارستانیەتیش لەلای خۆیەوە هەڵگری کۆمەڵێك بنەمایەو تیایدا جەخت دەکرێتەوە لەسەر شوناسو تایبەتمەندی کولتوریو مێژوو ئاینو ترادسیۆنی کۆمەڵگە.

لەم نێوەندەشدا وتەزای (ململانێی شارستانیەکان) سەری هەڵدا، کە بنیاتنەری ئەم تیۆرەش هانتیگنتۆنە کە لە وتارێکدا بە هەمان ناو لە هاوینی ١٩٩٣ لە گۆڤاری (فورین ئەفیرز)ی ئەمریکی بلاوی کردەوەو لە دوایشدا کردی بە کتێبێك لە ساڵی ١٩٩٦ بەناوی "پێکدادانی شارستانیەکانو بنیات نانەوەی سیستمی جیهانی" بە چاپی گەیاند[١٤١] هانتینگتۆن لە سەرەتای وتارەکەیدا دەربارەی (ململانێی شارستانیەکان) دەڵێت: "تیۆرەکەم لەسەر ئەوە دامەزراوە کە سەرچاوەی جەوهەری بۆ سەرهەڵدانی ململانێکان لەئەم جیهانە نوێیەدا ئایدیۆلۆژیو ئابوری نابێت، بەڵکو دابەش بوونی گەورە لە نێوان رەگەزی مرۆڤدا روو دەداتو سەرچاوەی ئەم ململانێ نوێیەش کولتوری دەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش دەوڵەتە نەتەوەییەکان خاوەنی زۆرترین هێز دەبن لە کاریگەریان بۆسەر کاروباری نێودەوڵەتی، بەلام لە

---

[١٤٠] د.صادق إطيمش:صراع الحضارات. http://www.iraqcp.org/members 0060210i.htm

[١٤١] د.السيد ولد أباه:اتجاهات العولمة، سەچاوەی پێشوو، ص٨٨

ئایندەدا ململانێ سیاسییە سەرەکییە جیهانییەکان دەکەوێتە نێوان نەتەوەو کۆمەڵە خاوەن شارستانیە جیاوازەکان، بۆ ئەم مەبەستەش ململانێی شارستانیەکان باڵ دەکێشێت بەسەر سیاسەتی جیهانیدا، لە ئایندەدا هێڵی تێکچووی نێوان شارستانیەکان دەبێتە هێڵی جەنگ لە ئایندەدا"[١٤٢]

لەکاتێکدا کە هانتینگتۆن تیۆری (ململانێی شارستانیەکان)ی خستەڕوو فیکرەو تیۆری "کۆتایی مێژوو" ونبوو، لە جیاتی فۆکۆیاما، هانتینگتۆن بوە کەسایەتیەکی دیاری گۆڕەپانی سیاسییو کولتوریو تیۆرەکەشی لەلایەن روناکبیرانو سیاسیەکانەوە بوە جێگەی گرنگی پێدان.

بەپێی وتەی (د. محمد عابد جابری) ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەندێك جار خودی کەسایەتیەکە رۆڵی خۆی هەیە، بەڵام رۆڵی راستەقینە لە روانگەی ئێمەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئەرکو بەرپرسیارێتیەی کە ئەو فیکرەیە هەڵی گرتووە.. فیکرەی کۆتایی مێژوو باسی لە رابردوو دەکرد، لەم روانگەیەشەوە جۆرێك لە دڵنیایی دابوە ئایندەی ئەمریکا، بۆ ئەم مەبەستەش جەختی کردبوەوە لەسەر سەرکەوتنی کۆتایی لیبرالیزم. ئەمەش بوبوە هۆی ئەوەی کە پرسیار دروست بکات لەسەر ئەو بودجە زەبەلاحەی کە لە ئەمریکا بۆ بواری بەرگری تەرخان کرابوو. کە ئەمەش پرسیارێکی بەجێ بوو، بەڵام تیۆری ململانێی شارستانیەکان، باس لە ئایندە دەکاتو هۆشداری دەدات بە رودانی جەنگ، بۆ ئەم مەبەستەش داوای ئاگاداریو هۆشیاریو خۆ ئامادەکردن دەکات بۆ بەرگری کردن لە نمونەی

[١٤٢] صموشيل هنتنجتون:"صراع الحضارات"مقالته الأولى المنشورة في"فورين أفيرز"ترجمة:خلدون شمعة،"الشرق الأوسط"،٢١-١/٢٢/١٩٩٥

شارستانیەتی ئەمریکیو ئەو بەرژەوەندیانەی کە لەسەری وەستاوە، بۆ ئـەم مەبەستەش پێویستە دارایی پێویستی بۆ تەرخان بکرێت[١٤٣].

هـانتینگتۆن دێـتو رەفـزی ئـەو دەرئەنجامانـە دەکـات کـە تیۆرەکـەی (فۆکۆیاما) باسـی دەکـات لـەوەی کـە شوناسـە شارسـتانیە جیاوازەکـان لـە شارستانیەتی رۆژئاواییدا دەتوێنـەوە، بـە سـیفەتی ئـەوەی کـە تـەواوترینو باشترینو چاکترین شارستانیەتە لەسەر ئاستی هەموو گەلانی جیهان[١٤٤].

تیۆری ململانێی شارستانیەکان لە روانگەی زانـستی سیاسـییەوە مامەڵـە لەگـەڵ کولتـوری شارسـتانیەتە جیاوازەکـان دەکـات، کـە ئەمـەش بـواری ئـەکادیمیو مەنهـەجی خۆیـەتی. لەبەرئـەوە ئەمـە بەبەشـێك لـە عەقڵیـەتی هەژمونگەرایی رۆژئاوایی دادەنرێت، لەکاتێکدا کە مامەڵـە لەگـەڵ بەرامبـەردا دەکات. (هانتینگتۆن) هەوڵی داوە لە روانگەیەکی سیاسییەوە خوێندنەوە بۆ شارستانیەتە جیاوازەکان بکات، ئەم خوێندنەوەیەش مەحکومە بە بیرۆکەی ململانێ، کە ئەمـەش لـە بیرۆکـە بنەڕەتیـەکانی فیکـری سیاسـییو زانـستی دەوڵەتداریە بەشێوەیەکی تایبەتی[١٤٥].

بە پێچەوانەی فۆکۆیاماوە، هانتینگتۆن، دێتو وەك تیۆریسینێکی بواری سیاسیی چەند رێوشوێنێکی سیاسییو سەربازی نیشانی ئەمریکا دەدات بـۆ چـۆنیەتی مامەڵـە کـردن لەگـەڵ رووداوەکـانی دوای جـەنگی سـارد، لـەم روانگەیەوە دەیەوێت ئەوە بە ئەمریکییەکان بڵێت کە شارستانیەتەکەمان لـە مەترسـیدایە ئەگـەر ئامادەکاریـەکی باشـی نـەبێتو لـە ئێـستاوە پلانێکـی

---

[١٤٣] د.محمد عابد الجابري:قضايا في الفكر المعاصر، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٤

[١٤٤] بروفيسور، زكريا بشير الامام :في مواجهة العولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٣

[١٤٥] زكي الميلاد:المسألة الحضارية المركز الثقافي العربي، ط١، ١٩٩٩،ل٤٧

ستراتیجی بۆ سەرکەوتن دانەڕێژرێت. لەبەرئەوە نەخشە ڕێگاکە سەرکەوتنە لە ڕێگەی جەنگو ململانێوە، ئەویش بە لاوازکردنی شارستانیەتەکانی تر و سەرخستنی شارستانیەتی ڕۆژئاوا دەبێت، بەپێی ئەم تیۆرە بازنەکانی ململانێ فراوان دەبنو لەسەر بنەمای شارستانیەتی ڕۆژئاوا خۆیان ئامادە دەکەن نەك تەنها ئەمریکا. لەبەرئەوە ئەمریکا بەڵێ سەرکەوتووە لە شەڕی ساردو بواری جەنگی ئایدیۆلۆژیادا، بەڵام لە بەرامبەر جەنگی کولتورو شارستانیەتەکان لە مەترسیدایەو بۆ ئەم مەبەستە پێویستە ئامادەسازی بکاتو هێرش بکات.

لە دوای نووسینی ئەم تیۆرەوە دەبینین ئەمریکا بە ئەم ئاراستەیە دەجوڵێتو هێزەکان دەجوڵێنێت، بەتایبەتی ڕووەو ڕۆژهەڵاتو جیهانی ئیسلامی کە خاوەن شارستانیەتی ئیسلامیە.

ئەو دوژمنەی کە هانتینگتۆنو خاوەن بەرژەوەندیە ڕاستەقینەکان لە ئەمریکادا دیاری دەکەن بریتییە لە ئاشتی، ئێمە لەو بڕوایەدا بووین بە هەرەسی یەکێتی سۆڤیەت ئاشتیو ئارامی باڵ بکێشێت بەسەر جیهاندا، بەڵام هانتینگتۆن دێتو ڕەزامەندی لەسەر وتەکەی (گۆرباتشۆف) دەردەبڕێت کە دەڵێت: "ئێمە بە کارێکی مەترسیدار هەڵدەستین بۆ ئێوە، ئێمە واتان لێ دەکەین کە ئێوە بێ دوژمن بمێننەوە"، چونکە ئەو لەو بڕوایەدا بوو کە بەناوی خۆپاراستن لە یەکێتی سۆڤیەت بڕەوی بە گوتارەکانی خۆی دابوو، بەڵام ئێستا دەبێت بگەڕێت بە شوێن دوژمنێکی باشتر لەو، دەبێت ئەمریکا بیر لە دروستکردنی دوژمنێکی نوێ بکاتەوە، چونکە هەست کردن بە بوونی دوژمن دەبێتە مایەی هێشتنەوەی هاوڵاتیانی

گەلی ئەمریکا بە پتەویو یەکگرتوویی[146] لەم بارەیەوە هنری کیسنجەر دەڵێت: "سیستمی جیهانی لە سەدەی ٢١ دا بەلای کەمەوە شەش هێزی سەرەکی دەگرێتەوە، ئەوانەش: ئەمریکا، ئەوروپا، چین، یابان، روسیا، لەوانەش هیندستان، ئەمە سەرەڕای بوونی چەند دەوڵەتێکی مامناوەندو بچوك"، ئەم هێزە سەرەکیانە لای کیسنجەر دەگەڕێتەوە بۆ پێنج شارستانیەتی گەورە[147].

بەلاّم هانتینگتۆن دێتو لەدوای روداوەکانی جەنگی سارد خوێندنەوەیەکی نوێ دەکاتو ئەو ناوچانە دیاری دەکات کە گرنگن بۆ دەست بەسەراگرتنی لەلایەن ئەمریکاوە، لەدواییدا دێتو شارستانیەکان بەپێی ویستە سیاسیەکانیان باس دەکاتو ئەوانە دیاری دەکات کە پشتیوانی لە یەکتر دەکەنو ئەوانەش کە دژایەتی یەکتر دەکەن.

هانتینگتۆن دێتو جەوهەری تیۆرەکەی دیاری دەکاتو دەڵێت: "کولتورو شوناسە کولتوریەکان لەسەر ئاستێکی گشتی شوناسی شارستانین، ئەوانن شێوازی یەکگرتن یان لێك هەڵوەشان یان ململانێ لەسەر ئاستی جیهان لە دوای جەنگی سارد دیاری دەکەن"[148]

لە روانگەی هانتینگتۆنەوە جیهان لەدوای جەنگی سارد لە حەوت یان هەشت شارستانیەت پێك دێت ئەوانیش (چین، یابان، هیندی، ئیسلامی، ئەمریکی) هۆکاری کولتوری هاوبەشو جیاوازییەکان بنەمای دروس کردنی بەرژەوەندی یان دوژمنایەتین لە نێوان وڵاتاندا. دەوڵەتەکانیش هەریەکەیان

---

[146] صموئيل هنتنجتون:صراع الحضارات:ترجمة طلعت الشايب،، : (دار الكتاب)القاهرة، ط٢، ١٩٩٩م، ، ل٢٧

[147] هەمان سەرچاوە، ل٤٦

[148] هەمان سەرچاوە، ل٣٧

سـەربە شارسـتانیەتێکی جیـاوازن، ململانـێ گەرمـەکانیش دەبنـە جـەنگی گەورەی شارستانی لە نێوان گروپو دەوڵەتـە جیاوازەکـان[149]، هـانتینگتۆن هۆکاری پێکدادانی شارسـتانیە جیاوازەکـان لـە ئاینـدەدا دەگەڕێنێتـەوە بـۆ چەند هۆکارێك لە وانەش:

١- جیاوازییە بنەڕەتییەکان لە نێوان شارستانیە جیاوازەکانـدا، ئەمـەش وا دەکات کە جیاوازبن لە زمـانو مێـژوو کولتـورو ترادسـیۆن، وەگـرنگتر لـە هـەموو ئەمانـەش ئایینـە. کـە دەبێتـە مایـەی جیـاوازی دیـارو ئاشـکرا بـە تایبەتیش لە چۆنیەتی سروشـتی پەیوەندیـەکانی مـرۆڤ لەگـەڵ خـوادا، یـان تاكو کۆمەڵ یان دەوڵەتو هاوڵاتیانو پەیوەندیەکانی نێوان خێزانو.. هتد.

٢- زۆربوونی کارلێکی نێوان گەلە جیاوازەکان لـە جیهانـدا رۆژ بـەرۆژ لـە یەکتر نزیك دەبنەوە، بەڵام شارستانیەکان دێنو ئەمانە سنوردار دەکەن.

٣- پرۆسەی تازەگەری ئـابوریو گـۆڕانی کۆمەڵایـەتی کـە هـەوڵ دەدات گەلەکان لە شوناسە لۆکاڵیەکان جیا بکاتەوە، بەمـەش دەوڵـەتی نەتـەوەیی لاواز دەبێت وەك سەرچاوەیەکی شوناس، لێرەدا ئاین دێتو ئەو بۆشاییە پڕ دەکاتەوەو زۆرجار ئەمەش لە شێوەی گروپی توندڕەوی ئاینیدا خۆی نمایش دەکات.

٤- گەشەکردنی هۆشـیاری شارسـتانی، ئەمـەش لـە ئـەنجامی ئـەو رۆڵـە دوالیزمەی کە رۆژئاوا دەیبینێت، سەرەڕای ئەوەی کە ئێستا هێزی رۆژئاوا لە چڵەپۆپەدایە. بەم هۆیەوە ئێمە دەبینین کە گەڕانەوەیەك دروسـت بـووە بـۆ رەگو ریشەی شارستانیەکان لەلای گەلە نارۆژئاواییەکان، لـەم کاتـەدا ئێمـە بەردەوام گوێ بیستی گەشەکردنی داخران بەسەر خۆدا دەبینو دەست گرتن

[149] هەمان سەرچاوە، ل٤٨

به ترادسیۆن‌و گه‌له نارۆژئاواییه‌کان زیاد ده‌کات‌و له‌م روانگه‌یه‌شه‌وه رازی نابن به ملکه‌چ بوون بۆ رۆژئاواو ئه‌مریکا.

٥- سیفاته‌کانی زه‌وقی کولتوری که‌مترین توانایان هه‌یه بۆ گۆڕانکاری‌و ده‌توانین بڵێین توانای چاره‌سه‌ری مامناوه‌ندیان نییه‌و زۆر گرانیشه که سیفاته کولتوریه جیاوازه‌کان به‌یه‌که‌وه کۆبکه‌ینه‌وه، ده‌بێت تاکێك نیوه‌ی ببێته فه‌ره‌نسی‌و نیوه‌که‌ی تری عه‌ره‌بی، به‌ڵام زۆر گرانه ببێته نیوه‌ی کاسۆلیکی‌و نیوه‌ی مسوڵمان، له‌م باره‌یه‌وه ناکۆکیه ئایدیۆلۆژیه‌کان ده‌مانخاته به‌رده‌م ئه‌م پرسیاره، "ئایا له‌گه‌ڵ کێدا بین؟"، به‌ڵام له ناکۆکی شارستانیدا پرسیاره‌که ئه‌وه‌یه تۆ کێی.. ئه‌م مانایه‌ش ناکرێت بگۆڕێت.

هانتینگتۆن له به‌شی پێنجه‌می کتێبه‌که‌یدا جه‌خت له‌سه‌ر به ئه‌مریکایی کردنی شارستانیه‌ت ده‌کاته‌وه. ئه‌مریکا له رۆژگاری ئه‌مڕۆدا نوێنه‌رایه‌تی شارستانیه‌تی رۆژئاوایی ده‌کات به‌هۆی توانا سه‌ربازی‌و سیاسیی‌و ئابوری‌و کولتوریه‌کان، له‌به‌رئه‌وه پێویسته هه‌موو وڵاتانی رۆژئاوایی پشتیوانی ئه‌مریکا بکه‌ن که ده‌ست به‌سه‌ر جیهاندا بگرێت، چونکه نوێنه‌ری شارستانیه‌تی رۆژئاوایه.

له به‌شی پێنجه‌مدا هانتینگتۆن ده‌ڵێت: "مانه‌وه‌ی رۆژئاوا پشت به ئه‌مریکیه‌کان ده‌به‌ستێت، چونکه جه‌خت ده‌کاته‌وه له‌سه‌ر شوناسی رۆژئاوایی، له‌سه‌ر رۆژئاواییه‌کان پێویسته که پاش ئه‌وه‌ی باس له شارستانێتیه‌که‌یان ده‌که‌ن وه‌ك شارستانیه‌تێکی بێ وێنه نه‌ك گشتی، یه‌کبگرن له‌پێناو تازه‌کردنه‌وه‌و پاراستنی له‌به‌رده‌م ئه‌و مه‌ترسیانه‌ی روبه‌روی ده‌بێته‌وه له‌لایه‌ن کۆمه‌ڵگه نارۆژئاواییه‌کانه‌وه"[١٥٠]

---

[١٥٠] صامويل هنتنجتون:صراع الحضارات، سه‌چاوه‌ی پێشوو، ل٣٨

تیۆری ململانێی شارستانیەکان هاو تەریب لەگەڵ سیاسەتی ئەمریکادا دەڕوات، لە دوای شەڕی سارد ئەمریکا بووە هێزێکی بێ وێنە Hyper power، بەهۆی هێزی ئابوریوسەربازیو تەکنەلۆژیەوە وای زانی کە ئیتر بۆتە جێگرەوەی شارستانیەتی جیهان بە تەواوی، لەکاتێکدا کە ئەمریکا لە جەنگی ساردا سەرکەوت، کە ئەمەش زۆر پێش روداوەکەی ١١ی سێبتەمبەر بو، پلانی ستراتیجیەتی ئایندەی خۆی کێشابوو کە بریتی بوو لە:

١- دەیوست پارێزگاری لە باڵادەستی خۆی بکاتو رێگە بگرێت لەهەر کێ برکێ کەرێك مەترسی بێت لەسەری، هەروەك ئەمە لەگەڵ ئیمپراتۆریەکانی تردا رویداوە، لەبەرئەوە لە هەوڵی ئەوەدایە کە دەست بگرێت بەسەر شارستانیەتی جیهانیداو بەکۆتایی مێژووی لەقەڵەم بدات.

٢- دەیەوێت بەرپرسیارێتی خۆی کەم بکاتەوە بەرامبەر بەو هەرێمە کەناریانەی کە سەرچاوە داراییەکانیان وشکی کردووەو بەرەو دواکەوتویی چوون، ئەویش لەژێر دروشمی ململانێی شارستانیدا ئیتر بە تەواوی خۆیان لێ دابڕێت.

٣- ئەم ئیمپراتۆریەتە نوێیە دەیەوێت جەخت لەسەر سەرکەوتنی هەمیشەیی بکاتەوە ئەویش بە پشت بەستن بە سەرکەوتنی لە بواری چەکدا، لەبەرئەوە دەبینین کە ئەمریکا بەتەنها خۆی نمایش دەکات لە هەموو بوارەکاندا، هەر ئەمریکیەك دەبینیت خۆی بە کەسایەتیەکی کەم وێنە لە قەڵەم دەدات، بازرگانی ئەمریکی دەبینیت کە خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی لە بازاڕدا.

٤- دەیەوێت سەرچاوەکانی وزە قۆرغ بکات، بەم هۆیەشەوە دەیەوێت کە کۆنترۆڵی شارستانیەتی مرۆڤایەتی بکات، بۆئەوەی باڵا دەست بێت

بەسەر هەموو ناوەندو کەنارەکانداو ئەمەش بەشێوەیەکی کۆتاییو هەمیشەیی رادەگەیەنێتو ئەمەش بەرنامی پارێزگارە تازەکانە.

٥- لەنێو ئەم هەولانەدا ئەم ئیمپراتۆریەتە دەگەرێت بەشوێن جەنگی هەرزان بەهادا ئەویش بە ئیستغلالکردنی توندوتیژیو ترسی لەناکاو Awe at shock لەناوچە لاوازەکاندا بە کەمترین تێچوون، بۆئەوەی دۆزەخ نیشانی ئەوانە بدات کە سەرپێچی دەکەن.

ئەگەر سەیری ئەمریکا بکەین دەوڵەتێکی بێ شارستانیەتو بێ گەلە، ئەو شارستانیەتەی کە دروستی کردووە کولتورێکی مێژوویی نییە، لەبەرئەوە ئەو سیفاتانەی کە لەشارستانیەتی ئەمریکی دا هەن، جێگەی گومانو دوودڵین، چونکە ئەو شارستانیەتەی ئێستا رۆژئاوا رابەرایەتی دەکات لەسەر دوو رەگەزی خوێنو قورِاو دروست بووە، ئەمەش شانۆی لە دایکبوونی مەنزومەیەکی ئابوری جیهانی بووە. لە هەناویدا سامانێکی گەورەی سەرمایەداری جیهانی کۆبۆتەوە. ئەمەش پاش سێ سەدە لە بەکۆیلەکردنی گەلانو گێرانەوەی بەندایەتیو لەناوبردنی شارستانیەتەکانی تر لە سەدەی شەش هەتا سەدەی نۆزدە، لە جینۆسایدی هیندیە سورەکان بۆ بارزگانی بەندەکان بە بەردەوامی لە شێوەی دامەزراوەیەکدا.

ئەمانە بەشێوەی داگیرکارێکی گەورە دەستیان دایە وێران کردنی شارستانیە بەنێوبانگەکانو سەربرِینی گەلەکانیان هەروەك (هرمان کورتر) کردی بە (ئەزتك) لە مەکسیك وە (بدرودی ئەزفیرو) کردی بە (مایا) لە (ئەلاند) لە دوای ئەمەوە دەتوانین هەست بە ئەو ئالۆزیە بکەین کە لەروی فیکریو ئابوریو کۆمەلایەتیو سیاسییەوە لەسەرمایەداری رۆژئاوادا هەیە، کە لە کۆتاییدا دەتوانین بگەینە ئەو راستیەی کە پێشکەوتنی رۆژئاوا لەسەر

حسابی وێرانکردنی ئەو سێ کیشوەرەیە کە بە تەواوی هەموو سەرمایەو شتە گرانبەهاکان گواسترانەوە بۆ ئەوروپاو ئەمریکا[١٥١].

بانگەشەی هانتینگتۆن بۆئەوەی ململانێکان لە ئایندەدا مۆرکێکی ئایینیو شارستانی وەربگرن کۆمەڵێك قازانجی بۆ رۆژئاوای شارستانی هەیە لەوانەش:

١- ئەم تێڕوانینە وا لە رای گشتی رۆژئاوایی دەکات کە رەفزی پێکەوە ژیان بکات لەگەڵ شارستانیەتو گەلانی تر، بەمەش هەڵوێستێکی دەستە جەمعی لە کۆمەڵگەی رۆژئاواییدا دروست دەبێت دژ بە پەنابەرانی گەلو نەتەوەکانی تر، ئەوانەی کە ئێستا لە رۆژئاوادا دەژین.

٢- پاڵ بە وڵاتانو هێزە رۆژئاواییەکانەوە دەنێت، کە زیاتر بچنە پاڵ یەكو یەکگرتوو بنو هاوپەیمانێتی دروست بکەن بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی رۆژئاوا.

٣- شارستانیەتی نوێ لەگەڵ بەرەوپێش چوونی بەردەوامی تەکنۆلۆژیادا بەشێوەیەك کە ئێستا بەرهەمە تەکنۆلۆژیەکان کۆنترۆڵی ژیانی مرۆڤیان کردووە، ئەمەش پلە بە پلە شوناسی شارستانی دەخاتە مەترسییەوە، لەبەرژەوەندی تەکنەلۆژیای نوێ، بۆ رێگرتن لەم حاڵەتە، لە ئێستادا دێنو دوژمنێك دروست دەکەن، ئەویش لەپێناو هاندانی گەلانی رۆژئاوا بۆ دەستگرتن بە شوناسی کولتوریانو گەڕان بە شوێن بنەماکانی دا، چونکە لە بەرامبەردا چەند شارستانیەتێکی تر هەن لە رێگەی جەخت کردنەوە لەسەر شوناسی خۆیان هەرەشەیان لەسەر رۆژئاوا دروست کردووە.

---

[١٥١] محمد محفوظ:الإسلام،الغرب وحوار المستقبل، سەچاوەی پێشوو، ل١١٨

هانتینگتۆن له وتارێكدا كه له گۆڤاری (فۆرین ئەفیرز) بڵاوبۆتەوه دەڵێت: "گەله نارۆژئاواییەكانی جیهان ناكرێت بێنه ناو تۆڕی چنراوی شارستانیەتی رۆژئاواوه، هەرچەند ئەم گەلانه شمەكی رۆژئـاوایی بەكاربـەرن یـان ئـەفلامی ئەمریكی ببینن، یان گوێ له مۆسیقای رۆژئاوایی بگرن، چـونكه گیـانی هـەر شارستانیەتێك زمانو ئاینو بەهاو ترادسیۆنه، شارستانیەتی رۆژئاواش بەوه جیـا دەكرێتـەوه كـه میراتگـری شارسـتانیەتی یۆنـانی رۆمـانیو مەسـیحی رۆژئـاواو بنـەماكانی زمانـەكانی گـەلانی لاتینیـه، هـەروەها هـەڵگری سـیمای جیاكردنەوەی ئاینو دەوڵەتو سەروەری یاساو فرەییه له سایەی كۆمەڵگەی مەدەنیداو دامەزراوەكانی نوێنەرایەتیو ئازادی تاكه كەسییه"[152]

هانتینگتۆن ئەو راسـتیه دەزانێـت كـه پێـشكەوتنی رۆژئـاوا لـه ئـەنجامی پـشت بەسـتنیەوه بـوه بـه هێـز، مێـژوو پـڕه لەئـەو رووداوه خوێناویانـه بەتایبـەتیش لـه قۆنـاغی ئیمپریـالیزمی كـۆنو نوێـدا، گەلـه نارۆژئاواییـەكان مێژوویەكی ئاشكراو رونیان هەیه لـەم بارەیـەوه، بـەڵام رۆژئاواییـەكان ئـەوه نـازانن، رۆژئاواییـەكان لـەناو سـنورەكانی خۆیانـدا شـتێكنو لـه دەرەوەی سنورەكانیش شتێكی ترن.

هـانتینگتۆن هۆكـاری گەشـەو سـەركەوتنی رۆژئـاوا دەگەڕێنێتـەوه بـۆ دوژمنایەتی بەردەوامی بۆ دەوڵەتـه نارۆژئاواییـەكانو دەڵێـت: "بـه درێـژایی چـوار سـەدەی رابـردوو، پەیوەنـدی رۆژئـاوا لەگـەڵ شەرسـتانیەته نارۆژئاواییەكاندا پەیوەندیەكی ناكۆكیی بوه بـۆ شارسـتانیەتی رۆژئـاوا"[153] لەم روانگەیەوه دەتـوانین بڵـێین كـه بـەجیهانیبوونی سیاسـیی ئامانجـەكانی

---

[152] د.عبدالعزيز عثمان التويجري:الحوار من اجل التعايش،دار الشروق، القاهرة، ط١، ١٩٩٨،ل٦٨

[153] صامويل هنتنجتون:صراع الحضارات سەچاوەی پێشوو، ل٨٤

روونە، ئەویش بریتییە لە هەوڵی رۆژئاوا بەتایبەتی ئەمریکا بۆ بەردەوام کردنی داگیرکاریو سەپاندنی هەژموونی خۆی بەسەر گەلە نارۆژئاواییەکانداو بەشێوەی دوژمنێکی شارستانیش مامەڵەیان لەگەڵدا بکات.

پاشان دەڵێت: "نوێگەریو گەشەپێدانی ئابوری نابێتە هۆی بە ئەنجام گەیاندنی نامۆبوونی کولتوری لەناو گەلە نارۆژئاواییەکاندا، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێتە هۆکاری زیاتری دەست گرتن بە کولتورە رەسەنەکانیانەوە، لەبەرئەوە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە رۆژئاوا واز لە وەهمی بەجیهانیبوون بهێنێت بەڵکو گەشە بە هێزە شارستانیەکانی خۆی بدات بۆ بەرەوروبوونەوەی شارستانیەتەکانی تر، ئەمەش پێویستی بەیەکگرتنی رۆژئاوا هەیە بە سەرکردایەتی ئەمریکاو جارێکی تر نەخشەی سنورەکانی رۆژئاوا دابڕێژرێتەوە لە چوارچێوەی پێکەوە گونجانێکی کولتوری"[١٥٤]

شارستانیەتی رۆژئاوا هەرچەند ئەو سەرکەوتنانەی بەدەست هێناوە، بەڵام لە حاڵەتێکی نائارامیدا دەژی، وە هەرەسی شارستانیەتی رۆژئاوا لە بەهێزترین ئەڵقەیەوە دەست پێ دەکات کە ئەمریکایە، چونکە ئەگەر سەیری ئەمریکا بکەین لە هەموو شتێك دەترسێت.. لە چەکە ئەتۆمیەکان لە مەترسی ژینگە، لە ئاستی گەشەی ئابوری لە ئایندەدا، ئەم شارستانیەتە شارستانیەتی ترساندنی مرۆڤە، ئەم شارستانیەتە کوتلەیەکە لە وزە، بەڵام کەسانی ناتەواو لە روی بەهای مرۆییەوە دەیبەن بەڕێوە.

قەیرانە ئابوریەکەی ئەمریکا لە چەند ساڵی رابردوودا ئەو راستیە دەخەنەروو کە نەك بازاڕی ئازادی لیبرالیزم نەبووە مایەی بەختەوەری بۆ

---

[١٥٤] د.عبدالعزيز بن عثمان التويجيري:الحوار من أجل التعايش،مصدر سابق، ل٦٨-٦٩

گەلانی جیهان، بەڵکو لە ئـەمڕۆدا بوەتـە نەگبـەتیو مەترسـی بۆسـەر ژیـانی ڕۆژئاواییەکان خۆشیان لە ئـەوروپاو ئـەمریکادا، ئـەمریکا ئێستا گـەورەترین مەترسـی ڕووی تێکـردووە کـە ئـەویش قـەیرانی ئابوریـە، دروسـت بـوونی مەترسی بۆسـەر ئـابوری مانـای ڕوخـانی گـەورەترین پایـەی سـەرمایەداریو لیبرالیزمی نوێیە، ئـەو پایـە گرنگەیـە کـە فۆکۆیامـا بـۆ کۆتـایی مێژووەکـەی پشتی پێ بەستبوو، چونکە بە لەرزەکەوتنی ئـابوری مانـای بەلەرزەکـەوتنو سەرەتای هەرەسی تەواوی برنسیپەکانی لیبرالیزمە، لەبەرئـەوە لـە ئـەمرۆدا لیبرالیزم نەك نەبووە مایـەی خۆشـگوزەرانی بـەڵکو بوەتـە هەڕەشـەیەك بـۆ ژیـانی خـودی ڕۆژئاواییـەکان، چـونکە بـەردەوامی قەیرانـەکان لـەوڵاتانی ئەوروپیو ئەمریکاو ئیـستغلال کردنـی سـەدان بـانکی گـەورەو خـراپ بـوونی گوزەرانی هاوڵاتیانو زیادبوونی بێ کاری، لە سیماکانی ئەو قەیرانـە ئابوریـە نوێیەن، ئەم هۆکارەش بوەهۆی ئەوەی ئـەمریکا ئـیتر سـنوری قەڵـەمڕەوی کەم بکاتەوەو سنوری خەونەکانی داگیرکاری بەرتەسك بکاتەوەو لـە عێـراقو ئەفغانـستان بکـشێتەوەو بگەڕێتـەوە بـۆ چارەسـەری قەیرانـەکانی نـاوخۆ، لەبەرئـــەوە لـــەم قۆناغـــەدا قـــەیرانی ئـــابووری ئاراســـتەی زۆربـــەی پلانـــە سـتراتیجیەکانی گۆڕیـوەو پێویـستی بـە پێداچـوونەوەی زۆر لـەو تیـۆرە سیاسـیانە هەیـەو لـە بەرامبەریـشیدا گەشـەپێدانی گـەلانی نارۆژئـاوایی لـە زیادبووندایەو لایەنگرانی شارسـتانیەتو جیهـانبینی ڕۆژئـاواش لـە دەرەوەی سنورەکانی ڕۆژئاوا لە قەیراندان.

دکتۆر (مەهدی مەنجەرە) لە زۆر جێگەدا باسی لەوە کردووە کـە ڕۆژئـاوا لــە سێکوچــکەیەکی ترســناك دەترسـێت، کـە ئـەوانیش: دیموگرافیـا کـە سەرچاوەی کۆچکردنە بەرە وباکور، واتە مەترسی ئایندە لە باشـورو یابـانو

ئیسلامەوەیە، یان ترسە لە هاوپەیمانێتی کۆنفشیۆسی – ئیسلامی[١٥٥] لەکاتێکدا کە تیۆری (پێکدادانی شارستانیەکان) دەخوێنیتەوە هەست دەکەین لەلایەن رۆژئاواوە ترسێك هەیە، چونکە ئەم شارستانیەتە دەستی کردووە بە داخوران و لاواز بوون و دەستی بە جوڵەیەك کردووە بەرەوخوارەوە، بەڕای هانتینگتۆن ئەمە لە ماوەی چوار سەدەدا روو دەدات، ئەم بۆچوونە بەروونی دەردەکەوێت کاتێك کە لە ناوەوە سەیری ئەم شارستانیەتە بکەیت، لە ئێستادا دەبینین کە فەلسەفەی پراگماتی و تاك گەرایی زاڵ بووە، رۆژ بەرۆژ ژینگەی کۆمەڵایەتی و خێزانی هەڵدەوەشێت و رێژەی تاوان و دەست درێژی و تەڵاق زیاد دەکات و رێژەی رەگەزی ئەورووپی لە دابەزیندایە لەناو وڵاتانی خۆیاندا.

هانتینگتۆن دەیەوێت لە رێگەی نوێکردنەوەی فیکرەی ململانێ و دروستکردنی دوژمنی وەهمی گیانی روخاو و بەزیو و هەرەس کردو لەلای تاکی رۆژئاوایی زیندوو بکاتەوە و حەماسێکی بە کۆمەڵ بۆ روبەروبوونەوەی مەترسیەکانی ئایندە دروست بکات، لەبەرئەوە دەبینین کە بەرابونێکی ئایینی لە دەرەوەی رۆژئاوا دەیانترسێنێت، بەتایبەتیش پەیدابوونی ئیسلامی سیاسی، کە بە دێوزمەیەك وەسفی دەکات کە هەڕەشە لە رۆژئاوا دەکات و دەیەوێت شارستانیەت و کولتورەکەیان وێران بکات.

روناکبیری مەغریبی بەناوبانگ دکتۆر محمد عابد جابری لە خوێندنەوەی ئالیەتی عەقڵی رۆژئاوایی لە دروستکردنی وێنەی ئیسلامدا جەخت دەکاتەوە لەسەر دوو ئالیەت ئەوانیش:

---

[١٥٥] ادریس هاني :المفارقة والمعانقة، سەچاوەی پێشوو، ل ١٧١

١- عەقڵی ئەوروپی ناتوانێت شتێك بچەسپێنێت ئەگەر لە رێگەی نەفی کردنی بەرامبەرەوە نەبێت، رۆژئاوا لە دوای هەرەسی شیوعیەت پێویستی بە ئیسلام هەیە بۆئەوەی شوناسی خۆی دیاری بکات، لەبەرئەوە ئیسلام بە ئارەزووی خۆی بەپێی پێویستیەکانی خۆی وێنا دەکات کە بگونجێت لەگەڵ ترسەکەیدا.

٢- عەقڵی ئیداری رۆژئاوا ناتوانێت دیدێکی رۆشنی بۆ ئایندەی خۆی بنیات بنێت، ئەگەر لە رێگەی کۆمەڵێك سیناریۆوە نەبێتو بۆ ئەوەش دەبێت پێداویستی خۆی بۆ دابین بکات. لەبەرئەوەش کە بۆ ئەم مەبەستە پێویستی بە دوژمنێك هەیە، نزیکترین سیناریۆ دروستکردنی وێنەی ئیسلامە وەك دوژمن.

ئەمریکا ناتوانێت لە ئاستی ناوخۆو دەرەوەدا بەبێ دوژمن بژی، ئەگەر دوژمنیش نەبێت دەبێت بەشوێن دوژمنێکدا بگەرێت، بۆئەوەی گەلەکەی لەروی (ئابوریو سیاسییەوە) ئامادە بکات بۆ بەروروبوونەوەی، هەروەها دامەزراوەکان بخاتە حاڵەتی ئامادەباشیەوەو بارگاویان بکات بۆ وەستانەوە بەروی دوژمندا، ئەو دوژمنەی کە هەڕەشە لە گەلو بەرژەوەندیەکانی دەکاتو دەیەوێت ئارامی لێ تێك بداتو بیدات بەسەر زەویدا[١٥٦].

هۆکانی راگەیاندنو دەزگا هەواڵگریەکان رۆڵی سەرەکیان هەبوو لە چەسپاندنی ئەم سیاسەتانە لە مێشکی ئەمریکیەکاندا، بەم هۆیەوە توانیان ئەم مەسەلەیە بکەنە فەزایەکی گشتی ئەمریکیو ئەمەش رێ خۆشکەر بوو بۆ چەسپاندنی هەر ستراتیجیەتێك کە بیانەوێت جێبەجێی بکەن لەسەر زەمینی واقیعدا، کۆکردنەوەی زانیاری سەبارەت بە (دوژمنی هەبوو) لەگەڵ

---

[١٥٦] محمد مقدادي :امريكا و هيكلة الموت سەچاوەی پێشوو، ل٧٤

(دوژمنی ئاینده) یەکێك بووە لە گرنگترین کارەکانی دەزگای هەواڵگری لە ئەمریکادا.

پێناسەکردنی دوژمنو دیاریکردنی شوناسی ئەو دوژمنە بە بەردەوامی دەگۆڕێت ئەویش بەپێی پێویستیەکانی سیستمی بازرگانی جیهانی کە بەردەوام لە هەوڵی بەهێزکردنو فراوانکردنی پێگەی نێودەوڵەتی خۆیدایە[١٥٧]. ئەو توێژینەوانەی کە هانتینگتۆن پێشنیاری کرد لە ئەو وتارەی کە گۆڤاری (فۆرین ئەفیرز) لە هاوینی ١٩٩٣دا بڵاوی کردەوە، لەو رێگەیەوە هەوڵی دا کە هەموو هێزە رۆژئاواییەکان کۆبکاتەوە لە پێناوی رێکەوتن لەسەر دیاریکردنی دوژمنی ئاینده، چونکە رۆژئاوا لەروی عەقڵیو شارستانیەوە ناتوانێت بەبێ دوژمن بژی[١٥٨].

هانتینگتۆن جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەگەرەکانی پێکدادانی ئیسلامو رۆژئاوا، بۆ ئەم مەبەستەش سەردێکی مێژوویی دە هێنێتەوە لەو دوژمنایەتیەی لە نێوان ئەو دوو شارستانیەتەدا هەیە و دەیگەڕێنێتەوە بۆ ١٣٠٠ ساڵ لەوەوپێشو بە جەنگی خاچ پەرستی دەست پێ دەکات، هەتا جەنگی عوسمانیو ئەوروپیەکانو ئیمپریالیزمی نوێش. هانتینگتۆن هۆکاری بەرەورووبوونەوەی حەتمی نێوان ئیسلامو رۆژئاوا دەگەڕێنێتەوە بۆ چوار هۆکاری سەرەکی.

١- زیاد بوونی زۆری دانیشتوانی مسوڵمان لە جیهاندا.

٢- رابوونی ئیسلامیو رەتکردنەوەی کولتوری رۆژئاوا.

---

[١٥٧] هربرت أ.شيللر:المتلاعبون بالعقول،ترجمة عبدالسلام رضوان، المجلس الوطني،للثقافة الفنون، كويت سلسلة عالم المعرفة(٢٤٣) ١٩٩٩م، چ٢،ل٥٩ .

[١٥٨] محمد محفوظ:الإسلام والغرب، سەچاوەی پێشوو، ل١٣٥ .

٣- زیادبوونی نفوزی سەربازیو کولتوری رۆژئاوا لە جیهانی ئیسلامیدا.

٤- کۆتایی هاتنی شیوعیەتو کۆتایی مەترسیەکانی یەکێتی سۆڤیەت، ئەمەش تەنها تێڕوانینێکی فیکری تاك لایەنەی روناکبیرێکی رۆژئاوا نییە، بەڵکو دیدێکی فراوانی گشتگیرە کە پیاوانی ئاینیو رۆژهەڵاتناسانو سیاسییەکان دەگرێتەوە، بە درێژایی مێژوو و تەنانەت مێژووی سیاسیی هاوچەرخیش لە ئەوروپا هەموویان جەخت دەکەنەوە لەسەر دووژمنایەتیان بۆ ئیسلامو بە دوژمنێکی مێژوویی لە قەڵەم دەدەنو لە ئێستاشدا ئەم جەنگە بەرگێکی ئایینی بەبەردا دەکەن وەك ئەوەی کە ئەمە شەڕێك بێتو هەر دەبێت بکرێت.

هانتینگتۆن وا دەبینێت کە وڵاتانی ئیسلامی زۆربەیان لە ئێستادا زۆرتر پابەندن بە بیروباوەڕە ئاینیەکانیانو شەریعەتەکەی، ئەمەش پەیوەستە بە دیاردەیەکی گەشەکردوو کە پشت ئەستورە بە زیادکردنی رێژەی دانیشتوان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر، گەڕانەوەش بۆ ئایین لە نێوەندی جەماوەردا بەوشێوە بەرفراوانە مانای جەخت کردنەوەیە لەسەر خودو بەهێزکردنی شوناسو ئەمەش لەبارودۆخێکی ئابوری خراپدا[١٥٩].

تۆماس ئەرنۆڵد وای دەبینێت کە جەنگەکانی خاچ پەرست وەك (بزوتنەوەیەکی رۆحی) وابوونو بە جەنگێکی پیرۆز لە قەڵەمیان دەدا، لەروی تیۆریەوە پیاوانی ئایینی ئەم جەنگەیان بە دادپەروەرانە ناوبردووە، سەرەڕای ئەوەی کە جەنگێکی پیرۆزەو خەڵك دەتوانێت چارەنووسی خۆی لەسەر دیاری دەکات، لەلایەکی ترەوە بەهۆی بوونی پەیوەندیەکی توندوتۆڵی سیاسیی لە نێوان ئەمریکاو ئیسرائیل بە بەردەوام جولەکەکان

---

[١٥٩] هەمان سەرچاوە، ل ٩١.

ویستویانە کە ئەمریکا بخەنە بەرەی خۆیانو لەو جەنگە مێژوویەی کە ئێستا بە دەستیانەوەیە دژ بە عەرەبو مسوڵمانان ئەمریکاش بخەنە بەرەی خۆیان، لەبەرئەوە لە رێگەی راگەیاندنەکانیانو لوبی بەهێزیان لە ناوەندەکانی بڕیاری سیاسیی هەوڵیان داوە کە ئیسلام بکەنە دوژمنی هاوبەشی هەردوولایان.

سەرۆك ریتشارد نیکسۆن باس لە راستی پەیوەندیە ئاینییەکانی نێوان ئەمریکاو ئیسرائیل دەکات، ئەوە رەتدەکاتەوە، کە بەرژەوەندی ستراتیجی یان شتی تر ئەو دو دەوڵەتە بەیەکەوە کۆبکاتەوەو لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئیلتیزامی ئێمە بەرامبەر بە ئیسرائیل هەڵقوڵاوی میراتێکی مێژوویی کۆنە، هیچ سەرۆك کۆمارێکی ئەمریکا ناتوانێت رێگا بدات بە وێرانکردنی ئیسرائیل، ئەمەش لە کتێبی (الفرصة السانحة) بە درێژی باسی دەکات"[١٦٠]

هەرکەسێك بە وردی تیۆری پێکدادانی شارستانیەکان بخوێنێتەوە ئەو راستیەی بۆ دەردەکەوێت کە هانتینگتۆن دەیەوێت بەرگێکی ئاینی بکات بەبەری ململانێکاندا. وەك هەموولایەك دەزانێت کەسیٚ ئاینی گەورە لە جیهاندا هەیە، کە ئەوانیش ئیسلامو مەسیحیەتو جولەکەیە. هانتینگتۆن دێتو هەردوو ئاینی مەسیحیو جولەکە دەخاتە بەرەیەكو ئیسلامیش لە بەرەیەکی تردا. ئەمەش بە روونی دەردەکەوێت کە شەرعیەت دانە بە داگیرکاری ئەمریکا بۆ ولاتانی ئیسلامی بۆ ئەم مەبەستەش بە جەنگی ئەفغانستانو عێراق دەستی پێکرد.

دکتۆر یوسف قەرزاوی دەڵێت: (شتێکی تر کە زۆر گرنگەو هاتۆتە ناو بەجیهانیبوونی کولتورەوە، کە هەرچەند ئەمەیان بە ئاشکرا باسی ناکەن،

---

[١٦٠] هەمان سەرچاوە، ل٢٧٣

بەڵام ئەمە هەیەو بریتییە لە بەجیهانی کردنی ئایین، کە بریتییە لە گرنگی دان بە بڵاوکردنەوەی عەقیدەی مەسیحییەت لەسەر ئاستی جیهان کە ئەویش کەنیسە مەسیحیەکانن، ئەمەش مانای ئەوەیە کە رۆژئاوا دەیەوێت ئیمپریالیزمێکی ئایینی بەسەر جیهاندا بسەپێنێت، هەرچەند شێوازی ئیمپریالیزمی کۆن لە داگیرکاریدا بەسەرچووە، بەڵام ئێستا ئەمریکا دێتو جارێکی تر لە شێوەی ئیمپریالیزمێکی نوێ دا دەیەوێت خۆ بسەپێنێت بەسەر جیهاندا، بەڵام ئەمجارەیان ئایین دەخاتە خزمەت بەجیهانی کردنی عەلمانیەتی ماددی. چونکە دەزانێت ئەو ئاینانەی کە رۆژئاوا دەیەوێت بەجیهانی ببن، ئیسلام رێگرە لە بەردەمیانداو ئەمەش گەورەترین بەربەستە کە رێگە لە بەجیهانیبوونی ئاینی دەگرێت[١٦١].

(ئیۆجین رۆستۆ) دەڵێت "ئەمریکا ناچارە کە دژ بە رۆژهەڵاتی ئیسلامی بێت بە فەلسەفەو بیروباوەڕەکەیەوە، چونکە ناتوانێت بێجگە لە هەر هەڵوێستە شتێکی تری هەبێتو ناچارە کە لە بەرەی رۆژئاواو دەوڵەتی جولەکەدا بێت، چونکە ئەگەر پێچەوانەی ئەمە بکات ئەوە دژ بە زمانو فەلسەفەو کولتورو دامەزراوەکانە"[١٦٢]

تیۆری ململانێی شارستانیەکان لە ئێستادا تەنها فیکرەیەکی سیاسی نییە، یان تەنها توێژینەوەیەکی ئەکادیمی بێت، بەڵکو لە ئەو زەمەنە مێژووییەدا کە دەکەوێتە نێوان روخانی یەکێتی سۆڤیەتو سەرهەڵدانی راپەڕینەکانی بەهاری عەرەبی هەڵوێستی رۆژئاوابوو، بەو جۆرە لە سیستمی نوێی جیهانیدا دژ بە جیهانی ئیسلامیو شارستانی بوون، لەبەرئەوە بە

---

[١٦١] هەمان سەرچاوە

[١٦٢] إبراهيم النعمة: المسلمون أمام تحديات الغزو الفكري،، مطبعة زهراء الحديثة، موصل، ١٩٨٦،ل٩

هەموو شێوەیەكو بەتایبەتیش لە رێگەی رژێمە پاشكۆكانی رۆژئاواوە بە هەموو شێوەیەك جەنگیان دژی رابوونی ئیسلامیو ژیانەوەی ئیسلامی راگەیاندبوو، بە هەموو شێوەیەك دژی ئەوە بوون كە گەلانی مسوڵمان بگەڕێنەوە بۆ شوناسی مسوڵمانێتی خۆیانو باس لە سەربەخۆیی خۆیان بكەن لە روی سیاسییو ئابوریو كولتوریەوە، لەو ماوە مێژووییەدا ئەمریكا رابەرایەتی رۆژئاوای دەكرد بۆ جێبەجێكردنی ئەو ستراتیجیەتەو لە ستراتیجیەتی بەرەو روبوونەوەی ئیرهابیش لە دوای ١١ی سێبتەمبەر گەیشتە چڵەپۆپەو كار گەیشتە ئەوەی كە برەوێكی زۆر بدەن بە دەستەواژەی (ئیسلامۆفۆبیا)و لەم رێگەیەشەوە تەنانەت ئیسلامیشیان وەك ئاینێكی بەرهەم هێنەری ئیرهابو توندڕەوی لە قەڵەمدا، لەو ماوە زەمەنییەدا زۆرتر لەو ململانێیەدا جەخت دەكرایەوە سەر ئیسلام. چونكە لە دوای روخانی یەكێتی سۆڤیەتو كۆتایی زەمەنی ئایدیۆلۆژیا، ئیسلام وەك ئاینێكی بان ئایدیۆلۆژی بوە یەكەمین هێزی روبەروبوونەوەی سیاسەتی هەژموونگەرایی رۆژئاوا، چونكە بەهێزی ئیسلام لەوەدابوو كە وەك شوناسێكی گەلە مسوڵمانەكان بوە پەناگەیەكی بەهێز بۆ وەستانەوە بەرووی بەجیهانیبوونی كولتوری رۆژئاواو ئەمریكا، شوناسە مسوڵمانێتیەكەیان بوە مایەی پاراستنیان لە بەرۆژئاوایی بوونی كولتورەكەیان، ئیسلام جۆرێك لە یەكگرتووییو پێكەوە گونجانو دڵنیایی رۆڵی بەخشیە گەلە مسوڵمانەكان.

بەهۆی باكگراوندە مێژووی و شارستانیەكەشیان، جۆرێك لە متمانەو كەسایەتییەكی بەهێزی دروست كردبوو بۆیان، دەسەڵاتەكانی ناوچەكەش كە هەموویان نموونەی سیستمێكی تاك رەویو عەسكەرتاریو ناعەدالەتی بوون، خۆیان بە سیستمێكی عەلمانیو بەپشتیوانێكی گەورەی رۆژئاوا لەقەڵەم

دەدا، ڕۆژئاواش بە بەردەوامی لە ڕوی سیاسییەوە پشتیوانی لێ کردوون‌و لە ئاست هەموو کارە نامرۆیی‌و توندڕەوی‌و ناعەدالەتیەکانیان بێ دەنگ بوون، هەموو ئەم وێنەیەکە لەلایەن ئەم دەسەڵاتانەوە بۆ ڕۆژئاوا دروست کرابوو، وای لە گەلانی ناوچەکە کرد کە بیر لە شوناسێکی تر بکەنەوە بۆ ڕزگاربوون‌و گێڕانەوەی ئازادی‌و چەسپاندنی دیموکراسی، ئەمەش لە دواجاردا خۆی لە سەرهەڵدانی بەهاری عەرەبیدا بینیەوە، کە زۆرجار پێی دەڵێت بەهاری ئیسلامی.

تیۆری ململانێی شارستانیەکان تووشی جۆرەها ڕەخنەو نووسین بوەوە کە دژی ئەم تیۆرە نوسراون، زۆرجار ئەم تیۆرە بە ئایدیۆلۆژی لە قەڵەم دراوەو هیچ پەیوەندییەکی بە زانستی سیاسییەوە نییە، بەهۆی ئەم تیۆرەوە ململانێ ئابوریەکانی گۆڕان بە هەوڵەکانی ڕۆژئاوا بۆ هێرش بردن‌و دەست بەسەرداگرتن‌و ململانێیەکی ئایدیۆلۆژی، ئەمەش بە ئاراستە وەرگرتن بوو لە ململانێ فیکری‌و کولتوریەکان، لە دوای ئەمەوە ئیتر سنوری دەست بەسەرداگرتن لەلایەن کۆمپانیا گەورەکانەوە بوونە سنورێك بۆ ئەو کولتورەی کە باسی لێوە دەکرد[١٦٣]، بەڵام لەدوای سەرهەڵدانی ڕاپەڕینی جەماوەری گەلانی مسوڵمان‌و هەرەسی ڕژێمە تاکڕەوە عەسکەرتارەکان کە هەموویان لایەنگری ڕۆژئاوابوون، وای کرد کە ئیستێك بۆ سیاسەتەکانی ڕۆژئاوا دابنرێت‌و لەسەر ڕۆژئاواییەکانیش فەرز بکات کە پێداچوونەوە بە سیاسەتی دەیانساڵەی خۆیاندا بەنەوە. لەبەرئەوە هەر لە سەرەتای

---

(١٦٣) د.محمد سعد أبو عامود: ميزان القوى بين الحضارات يتغير: الغرب يتدهور الحضارات الآخرى تعيد تأكيد ذاتها"،"البيان الأماراتية،١٢/١٠/٢٠٠١http://www.albyan.com

راپەڕینەکانەوە کە زانیان بەشێکە لە توڕەیی خەڵك بەرامبەر بە رژێمەکانو سیاسەتەکانی رۆژئاوا، بەخێرایی ئاراستەی دیدە سیاسییەکانیان گۆڕی لە پشتیوانی رژێمە عەسکەرتارەکانەوە بۆ پشتیوانی جەماوەری راپەریوو تەنانەت لە بەرامبەر دەسەڵاتێکی عەسکەرتاری وەك قەزافیدا لە رێگەی پەیمانی باکوری ئەتڵەسیەوە هێرشێکی کەمەر شکێنیان کردە سەر ئەو رژێمەو لە ماوەیەکی کەمدا هەرەسیان پێ هێنا، لەدوای ئەوەش رۆژئاوا پشتیوانی بۆ دەسەڵاتە هەڵبژێردراوەکانی ئەم وڵاتانە دەربڕیو داوایان لێکردن کە دیموکراسی بچەسپێننو فرەیی قبوڵ بکەنو بۆ ئەم مەبەستەش هەست دەکرێت سیاسەتێکی نوێیان گرتۆتە بەرو ئەو هەڵەیەش کە کردبوویان لەمەڕ ململانێی شارستانیو کولتوری جۆرێك لە پاشەکشەی پێوە دیارە، چونکە ئەمڕۆ گەلانی جیهان پێویستیان بەوە نییە کە لە جەنگێك رزگاریان بووە بچنە ناو جەنگێکی تر، بەڵکو پێویستیان بە لەیەکتر تێگەیشتنو پەیڤینی کولتورەکانو ناسینی ناسنامەی یەکتر هەیە، بۆ ئەوەی لەیەك نزیکبوونەوەی زیاتر رووبداتو هەتا دەکرێت بازنەکانی توندوتیژیو ململانێ کەم بکرێتەوەو ئاراستەی ژیانی گەلان بکرێت بۆ پێکەوەژیانو لەیەکتر گەیشتنو ژیان بەشێوازێکی ئاشتیخوازانەو هاوکاری کردنی یەکتر لە چارەسەری نەهامەتیو دواکەوتوویيو نەخۆشیو برسێتیو... هتد.

# سەرچاوەكان

## ١- كتێبە عەرەبییەكان


١- أباه، د.السيد ولد: اتجاهات العولمة، (المركز الثقافي العربي، دار البيضاء، ٢٠٠١)

٢- ابو ربيع، ابراهيم:العولمة هل من رد الإسلامي معاصر، إسلامية المعرفة، (        ، ٢٠٠٠)

٣- ابوالعلا، د.محمد حسين: ديكتاتورية العولمة، (مكتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٤)

٤- أشيللر، هربرت: المتلاعبون بالعقول، ترجمة عبد السلام رضوان، سلسلة عالم المعرفة(، الكويت، ١٩٩٩)

٥- البيطار، د.نديم، حدود الهوية القومية، نقد عام، (مكتبة بيسان، بيروت، ٢٠٠٢)

٦- التويجري، د.عبد العزيز عثمان:العالم الإسلامي في العصر العولمة، (دار الشروق، القاهرة، ٢٠٠٤)

٧- التويجري، د.عبدالعزيز عثمان:الحوار من أجل التعايش، (دار الشروق، القاهرة، ١٩٩٨)

٨- الجابري، د.محمد عابد:المسألة الثقافية، (مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٤)

٩- الجابري، د.محمد عابد:قضايا في الفكر المعاصر، (مركز دراسات الوحدة العربي، بيروت ١٩٩٧)

١٠- الجابري، د.محمد عابد:مسألة الهوية، العروبة والأسلام والغرب (مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٧)

١١- جاكوبي، راسل:نهاية اليوتوبيا، ترجمة:فاروق عبد القادر، عالم المعرفة، ع/٢٦٩، (مطابع الوطن، الكويت، ٢٠٠٠)

١٢- الحيالي، رعد كامل: نظريات معاصرة في الصراع الحضاري، (شركة الخنساء للطباعة، بغداد، ٢٠٠٢)

١٣- الحيدري، ابراهيم:صورة الشرق في عيون الغرب، (دار الساقي، بيروت، ١٩٨٦)

١٤- خريسان، د.علي باسم:العولمة والتحدي الثقافي، (دار الفكر العربي، بيروت، ٢٠٠١)

١٥- الخضيري، د.محسن أحمد:العولمة الأجتياحية، (مجموعة النيل العربي، القاهرة، ٢٠٠١)

١٦- خلدون، عبد الرحمن:المقدمة، (دار الكتاب اللبناني، بيروت، ١٩٨٢)

١٧- خليل، د.عماد الدين:التفسير الإسلامي للتأريخ، (دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٩١)

١٨- زيغلر، جان:سادة العالم الجود، لعولمة-النهابون-المرتزقة، ترجمة:علي خليل محمد، (مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠٠٣)

١٩- عبد الحميد، د.محسن:العولمة من المنظور الإسلامي، (مطبعة زيان، أربيل، ٢٠٠٢)

٢٠- عبد الهادي، د.حسين:العولمة النيوليبرالية وخيارات المستقبل، (مركز الراية للتنمية الفكرية، جدة، ٢٠٠٤)

٢١- عتريسي، الشيخ جعفر حسن:العولمة والعالم إدارة وأدوات، (دار المحجة البيضاء، بيروت، ٢٠٠١)

٢٢- عتريسي، الشيخ جعفر حسن:العولمة والعالم، (دار الحجة البيضاء، بيروت، ٢٠٠١)

٢٣- العزاوي، د.قيس جواد:العرب والغرب على مشارف القرن الحادي والعشرين، (مركز الدراسات العربي-الأوروبي "بحوث استراتيجية"١٩٩٧)

٢٤- العظم، د.جلال، حنفي، د.حسن:ماالعولمة ؟ (دار الفكر، دمشق، ٢٠٠٠)

٢٥- العظم، د.صادق جلال:ذهنية التحريم، (مركز الأبحاث والدراسات الأشتراكية في عالم العربي، دمشق ، ١٩٩٧)

٢٦- عمارة، د.محمد:الحضارات العالمية تدافع؟أم صراع؟في التنوير الإسلامي(٢٤)، (دار نهضة مصر، القاهرة، ١٩٩٨)

٢٧- عمارة، د.محمد:مخاطر العولمة على الهوية الثقافية، سلسلة في التنوير الإسلامي، (دار نهضة، قاهرة، ١٩٩٩)

٢٨- غليون، د.برهان:اغتيال العقل، (المؤسسة العربية للدراسات، بيروت، دون ذكر سنة الطبع)

٢٩- غليون، د.برهان:العرب وتحولات العالم(من سقوط جدار برلين إلى سقوط بغداد)، حوار اجراه:رضوان زيادة، (المركز الثقافي الغربي، ٢٠٠٢)

٣٠- غليون، د.برهان، أمين، د.سمير:ثقافة العولمة وعولمة الثقافة، (دار الفكر المعاصر، بيروت، ٢٠٠٢)

٣١- الغنوشي، راشد:مقاربات في العلمانية و المجتمع المدني، (المركز المغاربي، بيروت، ١٩٩٩٩)

٣٢- فوكوياما، فرانسيس:نهاية التأريخ والإنسان الأخير، ترجمة د.حسن الشيخ، (دار العلوم، بيروت ١٩٩٢)

٣٣- فوكوياما، فرانسيس:نهاية التأريخ والإنسان الأخير، ترجمة فؤاد شاهين، جميل قاسم، (مركز الأتحاد القومي، بيروت، ١٩٩٣)

٣٤- القرة داغي، د.علي محي الدين:نحن والآخر، (مؤسسة بانكي حق للنشر، سليمانية، ٢٠٠٦)

٣٥- كاظم، د.نجاح، العرب وعصر العولمة : المعلومات البعد الخامس (مركز الثقافي العربي، بيروت، ٢٠٠٢ )

٣٦- مارتين، هانس بيتر، شومان، هارالد:فخ العولمة، (ترجمة د.عدنان عباس علي، سلسلة عالم المعرفة، الكويت، ١٩٩٨)

٣٧- مجموعة المؤلفين: ندوة (اشكالية العلاقة مع الغرب)، (مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٧)

٣٨- مجموعة المؤلفين: ندوة(العرب والعولمة)، (مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٧)

٣٩- مجموعة المؤلفين:الأسلام والعولمة، (جهاد للطباعة والنشر، القاهرة، ٢٠٠١)

٤٠- مجموعة المؤلفين:الأسلام والغرب، صراع في زمن العولمة، (مجلة العربي، الكويت، ٢٠٠٢)

٤١- مجموعة المؤلفين:الحكم في عالم يتجه نحو العولمة(مكتبة العبيكان، الرياض، ٢٠٠٢)

٤٢- مجموعة مؤلفين:ندوة (صناعة الكراهية-في العلاقات العربية-والأمريكية)، (مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠٠٣)

٤٣- محفوظ، محمد:الأسلام والغرب، حوار المستقبل، (مركز الثقافي العربي، بيروت، ١٩٩٨ )

٤٤- المسيري عبد الوهاب:اشكالية التحيز رؤية معرفية ودعوة للإجتهاد(المعهد العالمي للفكر الإسلامي، فرجينيا، ١٩٩٦)

٤٥- مقدادي، د.محمد:العولمة رقاب كثيرة وسيف واحد، (المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ٢٠٠٠)

٤٦- مقدادي، د.محمد:امريكا وهيكلة الموت، (المؤسسة العربية للدراسات، بيروت، ٢٠٠٤)

٤٧- المنير، محمود سمير:العولمة وعالم بلا هوية، (دار الكلمة للنشر والتوزيع)المنصورة، ٢٠٠٠)

٤٨- النعمة، د.ابراهيم:المسلمون أمام تحديات الغزو الفكري، (مطبعة زهراء الحديثة، موصل، ١٩٨٦)

٤٩- نيكسون، ريتشارد:امريكا والفرصة السانحة، ترجمة محمد زكريا اسماعيل، (مكتبة بيسان، بيروت، ١٩٩٢)

٥٠- هاني، ادريس:المفارقة والمعانقة، (رؤية نقدية في مسارات العولمة وحوار الحضارات)"(مركز الثقافي العربي، بيروت، ٢٠٠١)

٥١- هنتنجتون، صوئيل:صدام الحضارات، اعادة صنع النظام العالمي، ترجمة طلعت الشايب، (دار الكتاب، القاهرة، ١٩٩٩)

٥٢- اليحياوي، يحى:العولمة أية عولمة؟، (افريقيا الشرق، المغرب، ١٩٩٩)

٥٣- يسين، السيد:اعادة اقتراع السياسة من الحداثة إلى العولمة، (الهيئة المصرية العامة للكتاب، قاهرة، ٢٠٠٦)

٥٤- يسين، السيد:العالمية والعولمة، (دار نهضة مصر، قاهرة، ٢٠٠٠)

٥٥- يكن، فتحي، طنبور، رامز:العولمة ومستقبل العالم الإسلامي، (مؤسسة الرسالة، بيروت، ٢٠٠١)

## ٢ توێژینەوەی زانكۆیی

١- فرج، أنور محمد:المركزية الغربية من التمركز حول الذات الى الهيمنة على الآخر رسالة ماجستير، جامعة نيلين، خرطوم، قسم العلوم السياسية، ٢٠٠٣.

٢- محمد، ثامر كامل: التحولات العالمية و مستقبل الدول في الوطن العربي، أطروحة دكتوراه، كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد، ١٩٩٧.

## ٣-گۆڤارەكان

١. ابراهيم، حسين توفيق:العولمة الأبعاد والأنعكاسات السياسية، عالم الفكر كويت، ع ١٩٩٧/٢٧)

٢. ابراهيم، حيدر:العولمة وجدال الهوية الثقافية، عالم الفكر م/٢٨/ع/٢٠٠٣

٣. البغدادي، د.احمد:أزمة الفكر الإسلامي في عصر العولمة، النهج، ع/٢٩/شتاء/٢٠٠٢)

٤. جابر، احمد:مركزية العولمة، شؤون الأوسط، (مركز الدراسات الأستراتيجية بيروت، ع/١١٣/شتاء، ٢٠٠٤

٥. جمال الطاهر:الهوية الثقافية العالم الإسلامي، قضايا دولية، ع/٢٢٧ ٨مايو/١٩٩٤)

٦. الجنحاني، د.حبيب:ظاهرة العولمة والواقع والأفاق، عالم الفكر، م/٢٨، ع٢/..اوكتوبر/ديسمبر ١٩٩٩)

٧. حجازي، د.أحمد مجدي:العولمة وتهميش الثقافة الوطنية، عالم الفكر، م./٢٨، ع/٢/اكتوبر/١٩٩٩)

٨. د.عمار طالبي:العولمة وأثرها على السلوكيات والأخلاق، الرائد، تصدر على الدار الإسلامية للأعلام بالمانيا، ع/٢٣٦، مايو ٢٠٠٢)

٩. الراضي، د.مجيد: الثقافة والعولمة، بحث في الجذور، النهج، ع/١٩/صيف ١٩٩٩

١٠. الزيدي، المنجي، الثقافة والمال، المستقبل العربي، ع/٢٩٣/٧/٢٠٠٣)

١١. سليم، جيهان:عولمة الثقافة واستراتيجيات التعامل معها في ظل العولمة المستقبل العربي، (مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ع/٢٩٣، ٧/٢٠٠٣)

١٢. شومان، محمد:عولمة الأعلام ومستقبل النظام الأعلام الذي، عالم الفكر م/٢٨/ع ٢/١٩٩٩

١٣. صوراني، غازي:العولمة وطبيعة الأزمات في الوطن العربي، المستقبل العربي ع/٢٩٣، ٧/٢٠٠٣

١٤. عبد لله، عبد الخالق:العولمة جزورها وفروعها وكيفية التعامل معها، عالم الفكر، (كويت، م/٢٨ ع/٢/اوكتوبر/ديسمبر ١٩٩٩)

١٥. الهاشمي، عامر:طرح مفهوم جديد لسيادة الدولة، دار السلام، (مجلة اسلامية سياسية عراقية)، ع ١٣٤، ١١/١٩٩٩

### ٤. سایتە ئەلکترۆنیەکان:

١٦. د.اسماعيل صبري عبدالله: الكوكبة الرأسمالية العالمية في مرحلة مابعد الإمبريالية http/mmsec.com/m4-files/awlama.htm

١٧. ميخائيل بنيامن:الأثنيات في ظل العولمة http:/www.ado-world.org/pub/number-13/glopaliseringhtm. 29/01/2007

٣ـ ( ابراهيم محمد جواد: نظرات في الثقافة والمثقف، النبأء، عدد ٤٤
http://www.annabaa.org/nba44/nazarat.htm

١٨. د.محمد صفوت قابل:العولمة الثقافية تحصر الإنسانية في التأريخ الغرب الحديث، p:/www.almarefah.com/article.php?id=984

١٩. الهوية الثقافية وسبل التعامل معها
http//:wwwnawaat.org/portail/article.php3?id article=125
٢٠. مجيد محمود عليلو :علم الأجتماعي الغزو الثقافي
www. e–resaneh.com/Arabic/seghafah/elm%20ejtema.htm-67K
٧–العولمة:جدل العدوان والمقاومة الثقافيين
www.balogh.com/islam/20032nci.htm
٨–عادل الحكيم: وسائل وادوات الغزوالثقافي
الثقافي http://alkadhum.org/alfurat/29/page/makalat.htm
٩ـ معتز جيسو:تجليات العولمة الثقافية،
http://www.mokarabat.com/s1894.htm
١٠ـ د.شاكر النابلسي:الأمة الهابطة والفن الهابط، .
http://rezgar .com/search/dsearch.asp?d=1&ni=1499
١١ـ د.محمد سعد أبو عامود:ميزان القوى بين الحضارات يتغير:الغرب يتدهور الحضارات الآخرى تعيد تأكيد ذاتها"، "البيان الأماراتية، ٢٠٠١/١٠/١٢
http://www.albyan.com
١٢ـ عبدالله تايه: الأعدام الثقافي والهوية، مجلة الموقف الأدبي. مجلة شهرية، تصدر عن اتحاد الكتاب العرب ـ دمشق ـ عداد ٤٢٥ أيلول ٢٠٠٦.
dam.org/nokifadaby/425/mokf425-007.htm http://www.awu-
١٣– أبو ديس: اشكالية الهوية الأسرائيلية ٢٠٠٦/٨/٢٦
news.phhp?maa=printme&id=114/www.alasra.ps://http
١٤– خمسي عبداللطيف: الهوية الثقافية بين الخصوصية وخطاب العولمة الهيمني. n4-o4khomsi.htm/www.fikrwanakd.aljabriabed.net://http
١٥– ابراهيم جاد الله: الثقافة العربية بين الخصوصية الكونية
http://www.rezgar.com/masp3i=1470
١٦– د. عثمان بن طالب: الهوية في مجتمع المعلومات.
http://www.jusur.net/fekr.wez.htm.

١٧- الحاجة العالمية للأصلاح، : العالم وتحوّلاته
www.mokarabat.com/m535.htm
١٨-وليام روبنسون :العولمة تسع سمات مميزة لعصرنا، ترجمة  مدحت الزاهد
http://www.iraqcp.org/0030118z.htm
١٩-د. جلال عتريسي :العولمة والاخلاق اي رهان مستقبلي؟
http://www.islamset.com/arabic/aioms/globe/res/talal1.html
٢٠-هاني نسيرة :مفهوم الهوية بين الثبات والتحول
http://www.islamonline.net/arabic/mafaheem/arts/  01/01/2007shtm
٢١-   د.صادق أطيمش :صراع الحضارات
http://www.iraqcp.org/members 0060210i.htm cvvsh

## ناوەرۆك